# دەرونزانی

## وتار- لێکۆڵینەوە- شیکردنەوە

**نوسینی:**

**یوسف عوسمان حەمەد**

**چاپی یەکەم**

**هەولێر ٢٠٠٤**



**لەبلاّوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی‌وئەدەبی نما**
**زنجیرەی (٢٧ )**

**سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی(١٥) کتێب**
**ئیسماعیل کوردە_ رێبین رەسوڵ ، جەمال پیرە**

**ناوی کتێب: دەرونزانی**
**نووسنی: یوسف عوسمان حەمەد**
**بابەت:وتار، لێکۆڵینەوە، شیکردنەوە**
**پیت چنین: عیماد رەسوڵ – بنار عەبدوڵلا**
**دیزاین: نما**
**تیراژ: ١٠٠٠**
**چاپی یەکەم: کوردستان/ هەولێر ٢٠٠٤**

# نێوەڕۆك







# پێشەکی

مێژووی دەروونزانی هەلقولاوی کرۆکی فەلسەفەی یۆنانی بووەهەرلەسەرەتاوە لای ئەوان ووشەی دەروونزانی(psychology) واتەدراسەکردنیعەقل یا رووح وبەشێك لەفەلسەفە بووەبەلاَم پێشتر فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ(٣٨٤-٣٢٢پ.ز) بە باوکی دەروونزانی ناونراوەهەرچەندە بەشێوەی هزراندن(التأملات) بۆچوونەکانی شیکراوەتەوە.دواتر زانای فیزیایی(جوستاف فخنر(١٨٠١-١٨٨٧) لەرێگای دەمارەکان وئەندامەکانی هەستیلێکۆڵینەوەی کردووە تاچەند رەوشتەکانی مرۆڤ دەگۆڕێ.(فخنر)دراسەی پەیوەندی نێوان ووروژاندنی فیزیایی وهەستەکانی کردووەهەمیشە پرسیاری ئەوەی کردووە توندی دەنگ چەندە تا گوێبیستی بین،یا شەپۆلەکانی رووناکی دەبێ چەند بێت تا هەستی بینین بجووڵێ.وشاکاری (فخنر) بریتی بوو لە هۆکارەکانی(سایکۆفیزیقیا) کەلەساڵی١٨٦٠ بلاَوی کردەوە.وە پزیشکی ئەلمانی ولیام ڤۆنت(wilheim wundt) (١٨٣٢-١٩٢٠) لقێکی لە مەعریفە دامەزراند لەکۆتاییدا ناوی نا دەروونزانی چونکە ئامانجی ڤۆنت دەرکردنی ناسنامەیەکی سەربەخۆ بوو بۆ دەروونزانی تا لەساڵی (١٨٧٩ ) لەزانکۆی لیبزج لەئەلمانیا یەکەم کارگەی ئەزموونگەری بۆ دەروونزانی دامەزراند بەمەش دەروونزانی خەسلەتی تەواوی زانستی پێبەخشرا. زۆربەی تاقیکردنەوەکانی ڤۆنت لەسەر پرۆسەی دەروونەلەش بوو کە پەیوەندی بەهەسەوەرەکان هەیە بەتایبەتی هەستی بینین.واتە پێوەری ئەو کاتە یان (الزمن) کرد کەدەکەوێتە نێوان رووداني ووروژاندن لەسەر هەستەوەر تاکاتی وەلاَمدانەوە بۆ لێکدانەوەی جۆری ووروژاندن واتە(الزمن الرجع). ویەکێك لە شاگردوقوتابی ڤۆنت (ستانلی هۆل)بوو کەیەکەم گۆڤاری دەروونزانی دەرکرد لەساڵی(١٨٨٧)لە ئەمریکا. وەدوو زانایی تر زۆر کاریگەریان بەسەر رەوتی دەروونزانی هەبُووە یەکەمیان زانای بەریتانی چارلس

داروین(١٨٠٩-١٨٩٢) بوو کە خاوەنی تیۆری پێشکەوتنە، کەپەیوەندی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ باس دەکات ئەم تیۆرە دەرگای لەبەردەم زانایانی دەروونزانی والآکردەوە بۆ بەراوردکردنی رەوشتی مرۆڤ وئاژەڵ.وزانایی دووەم جالتون (١٨١٠-١٩١١)کەپێشەنگی دەروونزانی ئەزموونگەری بوو لە بەریتانیا.کەدراسەی جیاوازی تاك وبلیمەتی زکماکی دەکردوە یەکەم کەس بوو کەرێگای راپرسی بەکارهێنا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر حالەتێك.ویەکەم کەس بوو کەرێگای ئاماری(الاحصائیە) بەکارهێنا بۆ پێوەری(القیاس) لەبواری دەروونزانی بۆ پێوەری توانای عەقلیوزیرەکیوگەورەترین زانا لەسەرەتایی سەدەی بیستەم کەرەوتی دەروونزانی پەنجا ساڵ بەرەو پێشەوە برد وەکو هەژانێك لەسەرتاسەری جیهاندا رووی‌دا بووە کۆلەگەی زێرینی دەروونزانی ئەویش سیگمۆند فرۆید(١٥٨٦-١٩٣٦)بوو کەخاوەنی قوتابخانەی شیکاری دەروونیەلەکۆتایی ئەم باسە مێژوویەدا دەگەینە یەك دەستەواژەدەروونزانی واتە لێکۆلینەوەودراسەکردنی رەوشتوکرداری عەقلیەلەتاك دا(مرۆڤ وئاژەل) لەژێر کاریگەری بۆماوەوژینگە.واتە رەوشت (behavior) کلیلی مەعریفە بزوێنەرەکانی دەروونزانیە لەژێر سێ ئامانجی سەرەکی دایە ﴿تێگەیشتن(تێبینی کردن)پێش بینی کردن، راگیرکردن (دەرئەنجام)﴾.

وەلە ئامانجە بەرچاووسەرەکیەکانی ئەم کتێبە تەنها پێشکەش کردن ودەرخستنی کۆمەڵێك بابەت ولێکۆڵینەوە نیەبەڵکو هەستی دەروونیە لەبەرامبەر رەوشتی گلۆبالیزمی مەعریفەدا کەبەرهەمی ئەم پێشکەوتنە دەبێتە هۆی فرەوان بوونی بواری کارکردن لە فەزای دەروونزانی ،رەنگە هەمووکارێك دوو دیوی هەیە (ئەکتیف ونێگەتیف)باش وخراپ بەلآم کارکردن وماندووبوون لەم بوارەدا خۆی لەخۆی‌دا چێژێکی مەعریفیوعەقلیە کەمەبەست خستنەرووی خزمەتێکی زانستیە یە لەو بوارەداوە سەرجەم نووسینەکانی ئەم کتێبە کە کۆکراوەی گۆڤارورۆژنامەکانە لەسێ تەوەر دەخولێتەوە(گوتار،لێکۆلینەوە،بابەتی شیکردنەوە) بەلآم هیچ نووسینێك وەرگێران(پەرچەڤەکردن)نیە،رەنگە کۆکراوەی





کۆمەڵێك سەرچاوەو دراسەکردن بێت لەشوێنی وکاتی جیاواز بەلآم وەرگیراوی دەقاودەق نەبووەبەهەرحاڵ سەرجەم بابەت وناوەرۆکی نووسینەکان بوونی هێلێکی فەلسەفی هاوبەش لەنێوانیان وای کردووە بەیەکەوە پۆلین بکرێن،چونکە نووسینی تر گەلێ زۆرن ئەوان لەهێلێکی تری مەعریفەوبواری لێکۆلینەوە یەك دەگرنەوەهیوام وایەشتێکمان بەشتێك کردبێ لەزەریالووشی زانستی دەروونزانی‌دا.

ئەگەر کرچ وکالیش بێت لەهەنێك رووەوە بەلآم سەرجەم نووسینەکان فاکتەری زانستی خۆی لەدەست نەداوە،رێزو نەوازش بۆ ئەوکەسەی دەیخوێنێتەوەورەخنەش دەگرێ.

یوسف عوسمان حەمەد

مامۆستای دەروونزانی

# شیکردنەوەی دەروونی بۆ زمان

بەهۆی زمان ەوە فەلسەفە بەدوای راستیدا دەگەڕێ لۆجیك زانستی هزرە نەك زانستی زمان،زمان لەفەلسەفە تەنیا دەلالەتی شیکردنەوەوروونکردنەوەیە.لەرووی سایکۆلۆجییەوە لێکۆلینەوە لە زانستی زمان بە بایۆفیزیاوی دەست پێدەکات ئەگەر لەهەموو کردارێکدا پەرچەکردار هەبێت ئەوە کارلێکە فیزیاوییەکانی ئامێری دەنگ پەرچەکرداری دەلالەتی مانایە جوولە پێش شیکردنەوە ولێکدانەوە دەبێت لێکۆلێنەوەوتێبینیکردن دوای رووداودەبێت زانایانی فەسلەجە زمان واپێناسەدەکەن کەوا کۆمەڵێك ئامێری پێوەندداری بایۆلۆجی بەکردارێکی فیزیایی لەدوای کرداری کیمیایی دەبێت کە پێش جوولەی دەرەکی دەکەون واتە پرۆسەیەکی شاراوەی ناوەوە هەیە کەبەهۆی زمان وەڵامی هەستە کرداری جوولەی کارتێکراوی مرۆڤ ودەوروبەرو تەنەکان روودەدات باشە کلیلی دەنگدەری ئەم پرۆسە ئالۆزە چییە؟

باشلار (جەخت لەسەر مانا دەکاتەوە کەلەدوای هەرجوولەیەك مانایەك هەیە)وەك جاك دریدا دەڵێ،(هەموو تەنەکان بەفرمانێکی هێزی فیزیاوی دەجولێنەوەومانا بەخش دەبن وزمانێکی سەربەخۆ دروست دەکەن کرداری دەنگەژێیەکانی مۆسیقا زمانی تایبەتییە هەمان مەدلوولی مانای هاژەی تاڤگە دەگەیەنێت بەرامبەر لێکدانەوەی سایکۆلۆژیی مێشك)جاك لاکان لەبۆچوونەکانی لەسەر تێهەڵچوونەوەی بیردۆزەکانی فرۆید هێمادەکاتە دەلالەتی زمان کەهەر جوولەیەك لە ئامێرەکان دەنگ وهەر دەربڕینێکی وشە هێمایەکە بۆ کۆمەڵێك مانا کەشیکردنەوەی جیاواز دەبەخشن لە بۆچوونی کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت بەپێی رەهەندەکانی کارلێککردوو بۆ دروستکردنی مانا دەگۆڕێت واتە کردار بۆ شیکردنەوەولێکدانەوە لەمێشك بۆ کرداری پوختەکراو لەتەنەکان بۆ لێکدانەوەی مانا.لەدرێژەی



باسەکەی(جاك لاکان)دا بۆمان دەردەکەوێت زمان دەلالەتی خودییە بۆ مەدلوولی بابەتی لەدوای هەر مانایەك جوولە کردارێك هەیە بۆ لێکدانەوەولەدوای هەر جوولەیەك مانایەکی پەرت هەیە بۆ خولقاندنی جولەیەکی داهاتوو.ئەنیشتاین دەڵێ؛کۆکرنەوەی جوولەی تەنۆلکەبچووککراوەکان لەیەك مانادا زمان دروست دەکات کەبە هۆی ئامێرەکانی زمانەوە گوزارشت لەوجولە فیزیاوییە کە دەکرێت، بەلاّم سایکۆلۆژیستەکان لەبۆچوونەکانیاندا دەڵێن بۆ هەر گرتەیەکی هزر لە بچووکترین شتی دەوروبەر یان هەر گرتەیەکی هزری وێنەیی یا خەیاڵی یا زانستی لە بچووکترین پرۆسەیدا کارلێکی مێشك ڕوودەدات کرداری زمان لەمێشکدا بۆ لێکدانەوە واتە ڕژانی هۆرمۆن بۆ سەر خانەی مێشك ئەو کاتە هزر دروست دەبێت بەهۆی زمانەوە گوزارشت لەو هزرە دەکرێت، هۆرمۆنی سمپاپاوی (کردارە خودییەکان)دەگرێتەوە بەهۆی ورووژاندنی دەرەکی کرداری ڕژانی هۆرمۆن پەیدا دەبێت بۆ دروستبوونی فیکرە یا بەهۆی کرداری سمپاپاوی ناخودییەکان هۆرمۆن دەڕژێتە سەرخانەکان و کارلێکی کیمیایی ڕوودەدات کە بەهۆی ورووژاندنی ناوەوە دەبێت خانەی مێشك دووجۆرن هەستی و جوولاّوە کە کردارو وەلاّمدانەوە دەبێت لەیەك چرکەی کارلێککردندا واتە زمان زنجیرە کردارێکی ئالۆزە بۆ لێکدانەوەی مانای هێمایەك کە هەر هێمایەك کۆمەڵێك لێکدانەوەی هەمە زانستی هەیە.هەر جوولەیەك دەربڕینی سایکۆلۆژی و دەرخستنی کەسێتی خاوەن جوولەیەو وەرگرتنی زمان زۆر نهێنیی لەخۆگرتووە(سکنر)دەڵێ: زنجیرە وەلاّمدانەوەی مەرجییە بەپێی سەرچاوەی ورووژاندن زمانی دیاریکراو دروست دەبێت، رەوشتی ئەو کەسە دەگۆڕێت لەماوەی چەسپاندنی پۆزەتیڤانە[٨] بۆ ئەو کەسە. ئەم بۆچوونە (سکنر)ی گەیاندە ئەو باوەڕەی کە کاتێ منداڵ داوای کێك دەکات هیچ جیاوازی لەگەڵ مشکدا نییە کەدەست لە قولاّیی خواردن دەدات لەڕووی گۆڕانی رەوشتی ئەو کەسە کە زمانێکی وەلاّمدانەوە بۆ پێداویستی مەرجی بەکاردێت. دوو جۆر قسەکردنیش هەیە بۆ وەلاّمدانەوەی مەرجی یەکەم؛ وشەو دەربڕین کە سەرنجی لایەنێکی

ژینگەودەوروبەر ڕادەکێشێت ئەمەش رەوشتی دیاریکراوی زمانە داوای پێداویستی دەکات لەدەوروبەر، بێ ئەوەی کار بکاتە سەر فاکتەری ژینگەو رەوشتی کەسانی تر.
دووەم؛ رەوشتی ئامرازی بەیەك بەستراو کە شێوازی فرمانی رەوشتی دەبێت واتە لەماوەی دەربڕینی وشە داوای گۆڕانی رەوشتی بەرامبەر دەکەیت و فاکنەری ژینگە دەگۆڕێت.
کە وشە لە کەسێکەوەیە مانا لە کەسێکی تر. بۆ سەلماندنی ئەم بیردۆزە(مکدونالد)، دوو کۆمەڵە منداڵی تەمەن یەك ساڵ تا دوو ساڵی هێنا گروپێکی یەکە یەکە بەتەنیا لەبەر تەلەفزیۆن داناو گروپەکەی تری بەیەکەوە لەبەردەم تەلەفزیۆن دانا دوای ماوەی تاقیکردنەوەی مەرجی دەرکەوت ئەو منداڵانەی کەوا بەیەکەوە بەشێوەی گروپ سەیری تەلەفزیۆن دەکەن زیاتر بەدوای مانای ئامرازەکانو شیکردنەوەی وشەکان دەگەڕێن پرسیاری زیاتر دەکەن بەڵام ئەو منداڵانەی کە بەتەنیا سەیری تەلەفزیۆن دەکەن شتەکان وەك ئامێر(تووتی) وەردەگرن، بێ ئەوەی مانای موفرەداتەکان لێکبدەنەوە فێری لاسایکردنەوە دەبن.چۆمسکی (Chomsky)دەڵێ، کاتێ منداڵ قسە دەکات بەدوای ڕێسای ڕێکخستنی وشەکان دەگەڕێت، ئەمەش مرۆڤ بەتوانای خۆی دەتوانێت ڕێساکانی زمان بدۆزێتەوەو دایبهێنێ،قسەکردن لە قۆناغەکانی سەرەتای دروستبوونە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی تەمەن ئەوا منداڵ دەتوانێ مانا بۆ وشەکان بدۆزێتەوەو ئاراستەیان دیاری بکات ورستەی تەواو دروست بکات. منداڵ بەهۆی توانای زگماکی خۆی دەتوانێت کۆمەڵێك ڕێسای زمان داڕێژێت،رستەی سوودمووندی لێدروست[٩] بکات وکۆمەڵ قەبوڵی بکات و جووڵەیەکی میکانیکی گروپی لەکۆمەڵ دروست بکات. ((چۆمسکی)) لەشیکردنەوەی کۆمەڵەی دووەمی نیشانەکانی ((پاڤلۆڤ)) دەڵێ؛ چەند ڕێسایەکی ڕێزمان لای منداڵ هەیە لەتەمەنی دوو ساڵیدا وشەی سەرەکی لەدەوروبەر وەردەگرێت وزنجیرەی وشەی تری پەراوێزی لەگەڵدا ڕێك دەخات بەڵام ڕێسایەکی تر منداڵ بەکاری دەهێنێت بەپێی بۆچوونی((ئیڤان پاڤلۆڤ))کە وشەی سەرەکی لەبەر دەکرێت لەگەڵ وشەیەکی تری



پاشگر بۆ روونکردنەوەو گوزارشتکردن وجۆرێکی تر لەورێسایە لەمنداڵ و گەورەکان بەکاردێت پێی دەوترێت بەدوای یەکدا هاتن.وەك یەك وشە دووبارەدەکرێتەوە لەرستەدا بەڵام هەریەکەو مانایەکی سەربەخۆی هەیە کەبەدوای یەکەوەن بەڵام بەتەنیا هیچیان مانا نابەخشن وەك (پۆل پۆل،دەستە دەستە،یەکە یەکە...)ئەمەش سایکۆلۆجیستەکانی زمان ناویان ناوە ڕێسای ((خۆیبوون)) واتە چۆن رستە لەخۆیەوە دروست دەبێت،تەواویی رستەکە گوزارشت لەکۆمەڵێك مانا دەکات بەڵام ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ئاراستەی دەروونی زمان ومەرجی کرداردا ئەواشێوەی زمان بەم شێوەیە دەبێت؛هەموو فاکتەرێك لەزنجیرە دەنگی زمان فاکتەرێکی تر دروست دەکات وئەمەش نابێتە پرۆسەی تێگەیشتنی زمان وشێوەی قسەکردن چونکە مرۆڤ وشە بە وشە لەرستەدا لەکاتی ئاخاوتن شی ناکاتەوە بۆ فاکتەری بچوك وبەش بەش،کاتێ گوێی لێ دەبێت هەوڵی تێگەیشتنی دەدات پێش دەستکردن بەلێکدانەوەو شیکردنەوەی وشەکان هەوڵی ئەوە دەدات بەشێکی گەورە لە رستەکە وەربگرێت،چونکە وەرگرتنی وشە بەپێی ژینگە واتە لەسەرەتای خوێندنەوە، خوێنەر دەبێ چاوەڕێی کۆتایی نووسینەکە بکات تا لێی تێبگات.دەروونزانەکان هەموو کاتێ هەوڵی ئەوە داوە لەشیکردنەوەی زماندا دووجۆر لێکدانەوەی میکانیکی بکەن، یەکەم: پێکهاتەی فۆرم، دووەم: پێکهاتەی ناوەڕۆك.زۆرجار لەپێکهاتەی فۆرم دوو رستەی لێك جیاوازن بەڵام لەپێکهاتەی ناوەڕۆك هەمان مەبەست و لێکدانەوە دەگەیەنێت ئەو کاتە ناوەڕۆك بەماناو جووڵەی دەروونییەوە پابەند دەبێت وبەپێچەوانەشەوە[١٠] کارلێکی پێکهاتەکانی فۆرم و ناوەڕۆك دروست دەبێت،بەڵام کاتێ پێکهاتەی فۆرم سەربەخۆ دەبێت لەگەڵ هیچ شتێك یەك ناگرێتەوە،لەوانەیە تەنیا بۆ جوانکاریی رستەی ئاخاوتن بەکار دەهێنرێت بۆ رازی کردنی تاکی بەرامبەر بۆ نموونە کە دەڵێین (دار،ئاگر،بەرد..) دوو بۆچوونی لێکدانەوەی سایکۆلۆژی هەیە بەپێی فەسلەجەی قسەکردن دوو پرۆسەی کرداری مێشك ڕوودەدات کەبەپێی زەمەن و تەمەن و وشیاری دەگۆڕێت و

لێكدانەوەی دوو واتا؛یەكەم: چەمكی هەستی واتە كەدەلێین دار ئەوا مانا بەرجەستە دەكرێت لەبیری وێنەی عەقڵ دەتوانین بەهۆی ئەندامەكانی هەستەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكەین لەهەموو بۆچوون و زمان وكەسایەتییەك وەك یەكە،چەمكی مانا ناگۆڕێت،بەلاّم دووەم چەمكێكی رووتە كەدەڵێین دار واتە هێزو ژیانەوەو خۆشی و ژینگە...كۆمەڵێ دەلالەتی تر كەبەپێی پرۆسەی ئیستدلالی عەقڵ مامەڵەی لەگەڵدا دەكەین چەمكی ئەو مانایە لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر لەشوێن وكاتی جیاواز دەگۆڕێت،هەر كەسەو بەپێی بۆچوون وهۆشیاریی خۆی بەكاری دەهێنێت وچەمكی هەستی لای مندالّ زیاتر بۆ دروستكردنی چەمكی زمان بەكاردەهێنرێت ولەگەورەكاندا چەمكی رووت زیاتر مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت نەك بۆ داهێنانی زمان بەڵكو بۆ داهێنانی پرۆسەیەكی هزری دەگەڕێتەوە. زۆر رەهەندی تر هەن كاردەكەنە سەر پێكهاتەی زمان جگەلە لەرێسای تایبەتیی خۆی ئەویش بڕی ئەو زانیارییەیە كە رستەی پێ دروست دەكرێت. زۆرجار رستەی درێژ لەهەموو روویەكەوە تەواوە بەلاّم خەڵك زۆر كەم بەكاری دەهێنێت و چەمكی خۆی لەدەست دەدات یان جۆرێكی تر لەزمانی زانیاری و ژیر بێژی، خەڵك بەكاری ناهێنێ،چونكە لێی تێناگات دەبێ پارچە پارچەی بكات بڕگەكان شیكردنەوەی مانایان بۆ بكات،چونكە ئەوەی رستەی درێژ دەردەبڕێت وەك ئەو كەسە نییە كەناتوانێت وەری بگرێت. زانایانی دەروونزانیی زمان لە گەشەی زماندا دەڵێن،زمان كردارێكی دروستكراوە لە بابەتێكی رابردوو كەپێكهاتەكەی دیار دەبێت زمان پالاّوتەی ئەو زانیاریيانەیە كە دەچێتە مێشك ولەكاتی پێویستدا بەكار دەهێنرێت،واتە پێوەندییەكی بەهێز لەنێوان گەشەی زمان و هزردا هەیە. هزر بریتییە لە چەند پرۆسەیەكی ناوەكی بەپێی وروژاندنی تاك بەپێی پیویس وەلاّمدانەوەی دەبێت وئاژەڵ بیردەكاتەوەو دەتوانێت هەندێ كێشەی ئاسان چارەسەر بكات كەلەگەڵ ئاستی خۆیدا بگونجێ واتە هەندێ كێشە چارەسەر دەكرێ بەبێ بوونی زمانی هاوبەش و تایبەتی بەلاّم لەمرۆڤدا هەموو كێشەكان پابەندن بەزمان،





بۆ نموونە (هاریوتHarriot) تاقیكردنەوەیەكی لەسەر چەند مندالّێك كرد هەندێكیان زمانیان تەواو بوو لەكاتی چارەسەر كردنی كێشەكانیان قسەوباسیان دەكرد. ئاستی زیرەكییان زۆرتر بوو بەلاّم كۆمەڵی دووەم كە گیروگرفتیان لەقسەكردن هەبوو نەیاندەتوانی كێشەكانیان چارەسەر بكەن ئاستی زیرەكییان كەمتر بووە. (سوسێر) دەڵێ،شیكردنەوەی هێماكانی زمان گۆڕینی بۆ دەنگ كارێكی میكانیكی ئاسانە بەلاّم لێكدانەوەی هەوێنی وشەكان و دروستكردنی مانا كارێكی گرانە نموونە؛تاك دەتوانێت پەرەگرافێكی ئینگلیزی بخوێنێتەوەو سەیری وشەكان بكات بەلاّم ناتوانێت بەهەمان خێرایی زەمەنی خوێندنەوە ماناكان شی بكاتەوەو لێیان تێبگات. كاتێ مرۆڤ گوێبیستی كەسێك دەبێت ئەوا خەریكی گوێ گرتنەكەیە توانای ئەوەی نییە شیكردنەوە بۆ وشەكان بكات كەبەهەمان تەوەرەی خێرایی گوێگرتنەكە هاوتەریب بێت ومندالّ كاتێ شتێك دەخوێنێتەوە خەریكی لێككردنەوەی هێماكان و شێوەی هێمایەكانە بواری ئەوەی نییە لەوشەكان بگات. مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە لەیەك كاتدا كۆمەڵێك هێما هەرس بكات،بەلاّم ماناكان پەیتا پەیتا لەزەمەنێكی تردا هەرس دەكات. گەڵێ جار رستە وەك بارستایەكی تەواو ئەو كاتە مانا دەبەخشێت. ئەگەر پارچە پارچەو هەڵوەشێنرایەوە ئەوا مانای راستەقینەی خۆی لەدەست دەدات،چونكە وشە بۆ وشەی دوایی دەبێتە راگرو راگیراو. گەڕانیش بەدوای مانادا لەكاتی خوێندنەوەی دەق پێویستی بەبارستایی تەواوی رستە هەیە.

زمان پێناسەی ژیانی مرۆڤ دەكات لەكاتە هەڵچووەكان و گوزارشت كردن لەكارە خودییەكان كەمانایەكی دروستكراوە بەپێی پێداویستی مرۆڤ، فاكتەرەكانی ژینگە وكۆمەلاّیەتی و پێداویستی تاك،هۆكاری پێوەندیكردن لەگەڵ دەوروبەرو ژینگەدا دروست دەكات،ئەو پێوەندییەش زمانێكی دروستكراوە بۆ لەیەكتر گەیشتن لەگەڵ فرمانی داهێنانی جوانكاری لەژیاندا كە زمانی دروستكراو زمانی هێما دەستكردەكانە كە عەقڵی مرۆڤ دروستی دەكات ئەمیش زمانی تەكنەلۆژیاو

پیشەسازیی مرۆڤە کە رکابەریی زمانی سروشتی دەکات. ئایا زمانی سروشتی مرۆڤ یان زمانی تەکنەلۆژیا تاکۆتایی جوولە فیزیاوییەکان دەمێنێتەوە؟ ئەم توێژینەوەیەی زمانی دروستکراویش لەخۆیەوە نەهاتۆتە بوون بەڵکو مێژوویەکی کۆنی هەیە بۆشیکردنەوەی وشەو ماناکەی کە زمانی فەلسەفە بدۆزنەوەو یەکەم کەس کەباس لەزمانی فەلسەفە دەکات (فرانس بیکۆن) و (دیکارت) بوون کەزمانیان لەسەر بنچینەی دەنگ وهێما شیکردۆتەوە، ئەمیش پۆلینکردنی شتەکان دەگرێتەوە لەسەر سیستەمی دەنگ وبینین‌زمانی فەلسەفەش هیلاکی زۆری مێشکی دەویست بۆ تێگەیشتن،بۆیە ئەم زمانە پێش نەکەوت ولەشوێنی خۆیدا مایەوە جا زمانێکی دروستکراوی تریان داهێنا کە رێزمانی زۆر دیاریکراوو مانادار‌بێت وهەموو کەس بەئاسانی مەبەست‌ومەدلوولی وشەکان بخوێنێتەوە بێئەوەی لەئاست وشەکان دابمێنێ تەنانەت ببێتە زمانی گەیاندنی پێوەندییە جیهانییەکان. یەکەم رەخنەی زمان لای ئەفلاتوون(٤٢٧-٣٤٧پ.ز) دەستیپێکرد بەناوی (گفتۆگۆکان) کەلەسوکراتەوە فێری بوو. دووشێوەی شیکردنەوە سەری هەڵدا سیماو نیشانەکە پێی دەوترێت دەلالەتی وشەئەم سەردەمەش سەردەمی زاراوەکانی ومانی کەپێویستییان بە تێگەیشتن وپۆلینکردنە کەزانستی زمان هەوڵی ئەمەی داوە وشەکان لەکورتترینیاندا درێژترین ماناو لێکۆڵینەوە بگرنەخۆ. جووڵەیەکی سوسیۆ- فیزیاوی دروست بکات. جێبەجێکراوەکانی زیرەکیی دەستکرد واتە تێگەیشتنی کۆمپوتەر لەزمانی سروشتی و توانستی مامەڵکردنی مرۆڤ لەگەڵ زمانی دەستکرد بەبەکارهێنانی هەمان ومانای سروشتی. چارەسەری جێبەجێکردنی زمانی سروشتی دەوەستێتە سەر زانستی زمانەوانیی ئامێری،کە زمانەوانی هێڵی تیۆری ئەو جێبەجێکردنەیە، بەهەموو شێوازوپێوەندییە بیرکاری ولۆجیکییەوەبەلاْم ئامێرەکانی ومان ودارشتنی بەرنامەی دانراو بەشێوەی ئەوەی لەزمانی‌مرۆڤ بگات ومامەڵەی‌لەگەڵدابکات ئەم پرۆسە گرامەرییەبۆ ساڵی (١٩٤٦) لە ئەمەریکا وبەریتانیا سەری هەڵدا، ئەمەش بەهۆی ئەو کارمەندانە بوو کە شفرە زمانییەکانیان دەکردەوەو لێیان تێدەگەیشتن، یەکەم



فۆرمولەبوونی ومانی بیرکاری ولۆژیکیش ساڵانی(١٩٥٧-١٩٦٥) لەلایەن چۆمسکییەوە رێچکەی زانستی وەرگرت و بەبۆچوونی چۆمسکی ئەمە گەورەترین پێشکەوتنی پێوەندیی نێوان لۆژیکی زمان وکۆمپیوتەرەو چۆمسکی چەند بیردۆزێکی رێکخست بۆ زمانی سروشتی وەك تیۆری گواستراوەی پتەوی زمان، بەرەو حاڵەتی شیکردنەوە، سێنتاکسی دەلالەتی،تیۆری دەلالەتی. ئەمەش بەهۆی سەرهەڵدانی چەند(سیستماتیك)ی تێگەیشتنی زمانی سروشتی، لە ئەپستمۆلۆژیای زماندا دەبێ ئامێرەکردنی زمان پێویستی بەو لایەنە زانینەوە دەبێ وەك رێزمان و پەیکەری زمان، نرخاندنی وشە بەکارهاتووەکان لەزماندا،چۆنیەتیی هەڵوەشاندنەوەو بەیەکەوە بەستنەوەی زمان و رێزبەندیی وشەکان لەسەر بنچینەی دەستەواژەو رستەی وەرگێراو بۆ مەدلوول‌واتە زمانی دەنگدەرەکان بریتییە لەرستەسازی ومۆرفۆلۆژی(صرف)بەلاْم زمانی مانا بریتییە لە جێگرەوەو بواری وشەکان. لەم کایەشەوە دەتوانین جیاوازی نێوان زمانی سروشتی و زمانی دەستکرد بکەین: زمانی سروشتی بریتییە لە (ئەو زمانەی کە مرۆڤەکان لەژیانی رۆژانەدا بەکاری دەهێنن بۆ پەیوەست بوون و لەیەکتر گەیشتن وشەکان لەڕووی ماناوە شاراوە دەبن‌چونکە دەلالەتی چەند مانایەك دەگەیەنن وزیاتر لەلێکدانەوەیەکیان هەیەبوونی رێزمانێکی ئاڵۆز بۆ لێکدانەوەو شیکردنەوەو بەرهەم هێنان، لەڕووی سایکۆلۆژییەوە کاریگەریی راستەوخۆ و زۆری دەبێت ورەوشت دەگۆڕێت، بەلاْم زمانی دەستکرد ( زمانێکە لەئەنجامی پێشکەوتنی (تەکنیك)ەوە دروست بووە بۆ گوزارشت کردن لە هزرێکی دیاریکراو وشەکان هیچ سێبەرێکیان نییە.هەر وشەیەك و بەتەنیا یەك مانا دەگەیەنێت لەگەڵ یەك لێکدانەوە‌رێزمانێکی سادەی هەیە بۆ ئیسدلال وبەرهەمهێنان، لەڕووی سایکۆلۆژییەوە کاریگەریی راستەوخۆی نییە تەنیا بۆ کارێکی ئیستاتیکی دەروونی دەتوانرێت سوودبەخش بێت). لایەنی تیۆریی زمان هەوڵی سەرخستن وپێشکەوتنی هێڵە جۆراوجۆرەکانی زمان دەدات وەك لێکۆڵینەوە لەفەرهەنگ و رستەسازی و وشەسازی و دەلالەتی و بەرهەمهێنەری و شیکردنەوەو

چۆنیەتیی وەرگرتنی زمان، بەلاّم لایەنی پراکتیکی زمان جەخت لەسەر جێبەجێکردنی کۆمپیوتەری زمان و تێگەیشتن لەزمانی سروشتی کەبە زانستەکانی تر پابەند دەبێ وەك زانستی دەرککردن،سایکۆلۆژیا، زانستی زمان، کۆمپیوتەر، فەلسەفە، زانستی بیرکاری....بەلاّم چارەسەرکردنی زمان دەبێ بایەخ بەشیکردنەوەو فۆرمەلەبەندیی زمان بدرێت لەگەڵ لایەنە دەلالەتییەکان،تێگەیشتنی دەق، بەرهەمهێنەری دەق، زانینی زمان و وەرگرتنی، شیکردنەوەی سێبەرەکانی زمان ((وەك مۆرفۆلۆژیا و دیاریکردنی ناوو فرمان وپیت و ئاوەڵناو بەگەڕانەوە بۆ رەگ و سەرچاوەی وشەکان))،بەلاّم سینتاکس کۆنترین شێوازی لێکدانەوەی زمانە وپەیکەرە دەلالییەکان پێك دێنێ. هەموو زانایانی زمان (چۆمسکی، کلیکوفر، بارت، سومیر، سوسێر...)لەسەر ئەوە رێکن کە کۆڵەکەی زمان بۆ چوار رشتە پەیوەست بوو:

١-فەرهەنگی وشەکان. ٢- وشەسازی ( مۆرفۆلۆژی). ٣- سیستەمی دەنگ. ٤- مانا (مەدلوول).سێ پێکهاتەی یەکەم هۆیەکانی کارلێك کراون بۆ بەدیهێنانی پێکهاتەی چوارەم واتە دالن بۆ مەدلوولی چوارەم کەئەمیش مەبەستی بەکارهێنانی زمانە و لەوانەیە گرافۆلۆژی شوێنی دەنگی وشەکان بگرێتەوە، چونکە زمان بەدوو کەناڵ گوزارشت لە خۆی دەکات (فۆنەتیك و نووسین) . ((نووسین وهێمای وێنە بێدەنگەکان پێیان دەوترێت گرافۆلۆژی)) و هەردوو کەناڵەکان لەڕووی دەروونییەوە دەوەستێتە سەر وەرگر لەگەڵ رادەی تێگەیشتنی لە قولاّیی مەبەیتی فۆنەتیك ونووسین ولێکدانەوەی وتن رەنگە زۆرجار دەربڕ(معبر) ئەو وشەیەی دەری دەبڕێ لەکایەی بیرکردنەوە بێت،بەلاّم کاتێ بیسەر وەری دەگرێ لەکایەبەکی تری جیا لەیەکەم دەبێت و لێکدانەوەیەکی جیاوازیان دەبێت لەکەسی یەکەم ودووەم. لەم تۆژینگەدا دەردەکەوێت زمان لە سۆسیۆلۆجیادا ئامرازی گەیاندن وپێوەندی وپەیوەستبوونی کۆمەلاّیەتییە،لە سایکۆلۆژیادا نیشانەی راستییەکانی رابردووە لەئاگاوە بەکاردەهێنرێت کە نائاگا وەك کۆگایەکی بیرکردنەوەی زمان بەکاردەهێنرێت و تەقینەوەی بارە چەپەکراوەکانی مرۆڤە لە ساتەکانی رابردوودا و



لەزانستی سروشتیشدا وێنەی دەنگە بیستراوەکانی فیزیاییە کە لە شەپۆل و لەرەلەری دەنگی پێکدێت لەنێوەندی بواری ماددیدا دەگوازرێتەوەو لە فسیۆلۆژیادا هێڵێکە لەهێڵەکانی بەرهەمی هەناسەدان و هەناسە وەرگرتنە کەپرۆسەیەکی فەسلەجیی هەناسەدانە لەو کاتەدا کارێکی تر ئەنجام دەدرسێت بەهۆی رژانی هۆرمۆن بەسەر خانەکانی مێشکۆڵەدا، کەقسەکردن و درێژەپێدانی کرداری پانتایی زمان دروست دەبێت. (ف.د.سوسێر) لە ئەپستمۆلۆژیادا پێوەندیی نێوان فەلسەفە و زمان دیاردەبێت وەك تاقیگەی زمان خۆی دەخاتە بەردەم مەعریفەکانی فەلسەفە، ئەوانەی بایەخ بەزمان دەدەن چ لەڕووی لێکۆڵینەوەو رەخنە بێت یان لەڕووی نووسینی دەقی هونەری دەیانەوێ جێگەی فەیلەسوفەکان بگرن و لێکۆڵینەوەکان تێکبشکێنن،واتە زمان سیستەمێکی ئامادەکراوی هەڵگیراوی مێشکە دوای فەلسەفە و سۆسیۆلۆجیاو سایکۆلۆجیا دەکەوێت. مەبەستی مەعریفی لێرەدا ئەوەیە کە زمانەوانی نەك قسەکردن(Speech) بە دروستبوون وفۆرم وسیستەمییەوە بەکۆن ونوێ وگشتی و پاراو ونووسراووبیستراوەوە هەموویان لە پێکهاتەیدا بەشێکن یان داتاشراوی عەقڵن کەپێی دەوترێ عەقڵی زمان، ئەمیش خۆی لەخۆیدا سیستەمێکی مێشکە هەموو وشەیەکی هەڵخەڵەتێنراو یاری بەعەقڵی هەڵخەڵەتێنراو دەکاتئەو کاتە زمان دەبێتە ئالیەتێکی روونکردنەوەو فەیلەسوف دەبێتە گەمەکەرێکی زاراوەی زمان کەشێوەی زمان لەگەڵ ناوەڕۆك جیا دەبێت یا دالی قسەکردن لەگەڵ مەدلوولدا شتێکی جیایە. ناوەڕۆك سەربەخۆ لەمیکانیزمی شیکردنەوەدا بۆشاییەکی نەواو دروست دەکات کە ئەندێشەی مرۆڤ تێیدا سەربەست بێت بۆ بیرکردنەوە،بەلاّم دالی وشە تەنیا یەك ئاراستەی هەیە بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ کە دەنگە ماددییەکانی فیزیا بۆ هزری لێکدانەوە دەگۆڕێت. زانست لای (سوسێر) گۆڕینەوەی هەرای دەنگەکان بۆ هارمۆنیەتی سەمفۆنیای مانا دەبێت ئەمەش بەوە دەبێت کە زمان نەبێتە تەنیا ئامراز یان لێکۆڵینەوە لەخۆیەوە بۆ خۆی، واتە گواستنەوەی زمان لەهۆیەکی ئاسان بۆ ئامانجێکی گەورەو قورس لەپەراوێزەوە بۆ

ناوەڕۆك لەمەنگەوە بۆ جوولانەوەی بەردەوام، ئەمەش لە ئەپستمۆلۆژیای زماندا وەك جوولانەوەیەکی زانستی دەبێت کە هزری مرۆڤ قیوولی بکات بۆلێکدانەوەی راستیی ژینگە خۆی وەك هزری گومان (سێوەکە کەوتە خوارەوە) یاسای کشانی زەوی پەیدابوو، بەلام یاسایەکە خۆی وجوودی هەبوو لەسروشتدا. (نیوتن) تەنیا دالی یاسایەکانی لەدەوروبەردا کۆکردەوەو مەدلوولی خۆی هەبووە پێشکەوتنە خوارەوەی سێوەکە،چونکە جوولەیەکی تری زانستی لەناو بوونی زماندایە کەپێی دەوترێت زانستی زمان (زمانەوانی). خاوەنی ئەم لێکۆڵینەوەیە (ف.د.سوسێر) بوو کەپشکنینی بیلۆگرافیای وشەی وەك زاراوەیەکی یەکگرتوو ئەنجام دا بۆی دەرکەوت لەناو بیلۆگرافیای وشەدا وشەو مانا هەیە کەبەیەکەوە بەستراون(دال ومەدلوول)( Signfid and Signifiont) کە ناتوانرێت لێك جیابکرێنەوە. دال واتە وێنەی دەنگ کە مانایەکی دەروونی هەیە ئەمەش هەر بەتەنیا دەنگ نییە، بەڵکو وێنەی هورە بۆ دەربڕین کە بەقسەکردن تەواو دەبێت، ئەو وێنە هوریە دەبێتە مەدلوول کەبە پاشینەی وشەوە نابەسترێتەوە، پەیوەندی نێوان وێنەی (دەنگ)ی زمان و کرداری دەنگ فیزیاوییە لەگەڵ مەدلوول و وێنەکردنی شتێك بەمانای فەلسەفییەوە کەوێنە بەمانا سایکۆلۆژی دێت و وێنەبین بەمانای کۆمەلایەتی دێت، بەلام ئەگەر دەنگی فیزیاوی و دەنگی دەنگی وێنە لەزەمەنێکیتردا ئامادە نەبوون ئەوا هێماو نیشانە نووسین و رەوشت دەبنە وێنەی هزری زمان کەپێی دەوترێت سیمۆلۆجیا. رووالەتی زاتیی (سیمیایی)کەپەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەی زماندا هەیە دوو جۆرن سیمیایی دیاریکراو، سیمیایی گشتگیر﴿سیمیا((واتە لێکۆڵینەوەی شێوەی سیستمە دەلالییەکان بەوە ناوەستێ کەلەهێماکان وپێوەنییەکانی نێوانیان بکۆڵێتەوە، بەڵکو لەپێوەندی نێوان هێماکان و دەلالەتیشیان و پێوەندیی نێوان هێماکان ئەوانەی بەکاریان دێنین بکۆڵێتەوە))﴾. ئەم دوو جۆرە یاساو بناغەی نیشانەکان وهێمایەکان دەگرێت بەجوولەی فیزیای دەوروبەرو بایۆ- میکانیك بەکاری دەهێنێت. زۆر بیردۆزی جیا دەربارەی کاری سیمیایی لەزماندا هەیە کەپۆلینی زمانێکی تایبەتی دەکات





جوولێنەری هزری (قسەکردن/ زمان) دەبێت کە کۆکراوەی چەند حالەتێکی سایکۆلۆژییە لەتاك بۆ گوزارشتکردن لەمەدلوولێکی ناوەوەی عەقڵ، کاتێ زمان فریای ناکەوێت ناتوانرێت تەواو مانا بدات بەدەستەوە ئەوا سیمیا جێگای دەگرێتەوە یان زمان توانای دەربڕینی نییە، وەك زانستی نیشانەکان بەکاردەهێنرێت کە هێوێکی سایکۆلۆژی دەتوانێت بخوێنێتەوە. خوێندنەوەی ئەم نیشانانە دەربڕینە لەبارێکی تاوگیری هەڵچوون بەهەموو جۆرەکانییەوە.

ئەمەش لەپێکهاتەی (کات- شوێن)ی زانستی سروشتی دەگۆڕێت، چونکە زانستی نیشانەکان و هێمایەکان یاسایەکی دیاریکراوی هەیە لەسەری رێککەوتوون کەتوانای بەرزی دەبێت. بەپێی ئەم یاسایە (باشلار)دەڵێت لەزانستی سروشتی دووجۆری تری سیمیایی هەیە؛سیمیای جۆرو سیمیای جێبەجێکردن. ئەمەشیان کاری تەئویل (هرمینۆتیکا)وپێناسەکردنی حالەتەکانی زمانە لەرێگای تێکستی ئەدەبییەوە. کێشە لێرەدا کێشەیەکی زانستی نییە، بەڵکو لەڕووی سایکۆلۆژییەوە کێشەی هزری رازیبوون وهەرس کردن و تێگەیشتنە لەدەق، توانای کۆنترۆڵکردنی هەڵسەنگاندنی دەقە ئەمەش تەنیا وێنەی دەق خۆی دەبێت لەهزری تاکدا. (جاك دریدا) دەڵێ:

سیمیای جۆر دەبێ کێشەی ئەپستمۆلۆژیای ناوەوە دەربڕێت، واتە گەڕان لەدوای سروشت وحالەتی میتافیزیقیا، بەلام لەسیمیای گشتگیردا حالەتی زمان دەگۆڕێت، چونکە سیستەمێکی تایبەتی ناخوێنێتەوە، بەڵکو شتەگشتییەکان باس دەکات، (میشیل فوکو) باس لەوە دەکات ئەگەر (ئەرستۆ) وەك فەیلەسووفە زمانییەکان هەڵسوکەوتی لەگەڵ لۆژیك بکردبایە ئەوا کارەکە ئاسانتر دەبوو. ئەرستۆ هەوڵی ئەوەی دابوو توێژینەوە لە مەدلوولی هەموو زانستێك بەجیاو سەربەخۆ بکات بێ ئەوەی ئامرازی پێوەندیی لەنێوان زانستەکان دروست بکات.... کەبایەخ زیاتر بەرستە دروستکراوەکان بدات،پارچە پارچەکردنی وشەکان بۆ کاری دەروونی بەجێبهێڵێت.بواری پرسیارکردن لای خوێنەر دروست بکات کە ئیدراك هەندێك شت دەنووسێت ئەوکاتە پرسیار دروست دەبێت وەك لەڕووی دەروونییەوە کاتێ

هەندێك هێڵی تاك وكۆ نارێك دەكێشین وێنەیەكی هەڕەمەكیی وەك (كەروێشك، سەری مرۆڤ....)دەردەچێت ئەوا پاشینەی ئەو وێنەیە لەئیدراكی شاراوەدا بوونی هەیە، لەساتێكی (بیركەوتنەوەی ئازاد) بەشێوەی هەڕەمەكی تەرجەمەی ئەو هزرە دەكرێت بۆ نووسین وهێمای سیمیایی كە گوزارشت لە زنجیرە كارێكی كیمیایی مێشك دەكات،بۆیە دەپرسین چۆن ئەم وێنەیەم كرد مەبەستم چی بوو لەم هێڵانە بۆ دروستكردنی تەنێك، ئەمەش كارێكی بەرجەستەیە بۆ زمان، چونكە دەبێتە شیكردنەوەی گوتاری فەلسەفی بۆ خود كە خود بەمانایەكی گشتی بەكارهێنراوەو كە بۆچوونی جیاواز لەنێوان زماناسی دروست دەكات بۆ شیكردنەوەی دەروونی زمان، بەلاّم شیكردنەوەی فەلسەفی باس لەوە دەكات ئایا خود لەسەروو یان لەقوولاّیی گوتاری فەلسەفییە یان بەشێوەیەكی میتافیزیكی جیاواز ورێگایەكی یەكانگیر دەردەكەوێت كە لە عەقلّی رۆژئاوادا ئاماژە بەسیمیای تەكنەلۆژیا دەكات.

(رۆلان بارت) دەڵێت:

زانستی زمان دەستپێشخەریی تێگەیشتنێك دەكات كە شیكردنەوەیەكی فرەوان دەدات بەزنجیرە دیاردەیەك ناوەڕۆكی ئەم دیاردانە بەهۆی تەئویلكردن دەبێت كەزمان تەنیا تێگەیشتن دەدات،ناوەڕۆك ئاشكرا ناكات تەنیا بەهۆی دیالیكتێكی ناوەڕۆك نەبێت ئاشكرا نابێت،كاتێ ئەم پرۆسەیەش روودەدات چەند تێگەیشتنی تر روودەدات و پێوەری ئەبستمۆلۆژیا دەگۆڕێت. میتافیزیانە كاریگەری رەت دەكاتەوە وەك (وشەیەك) لەسەرەتای مێژوودا بەجۆریك بۆ مانایەكی تر بەكارهاتووەو بە تێپەڕبوونی مێژوو و گۆڕانی شوێن كاركراوەتە سەر ئەم وشەیە ومانای تری بەخشیوەو لەدەقی ترو پەڕەگرافی تر بەشێوەیەكی تر شیكردنەوەی ئەپستمۆلۆژی بۆكراوەو گەلێ جار وشە لەڕوویماناوە گەڕاوەتەوە سەر یەكەم بەكارهێنانی. (كانت)دەڵێ شێوەی بەكارهێنانی loolpeche وشە لە دەقی فەلسەفەدا گەڕانەوەیە بۆ مێژوویەكی بەردەوام. بەكارهێنانی وشەو بەرەوپێشبردنی هزر مانای ئەوە نییە رابردووی زمان رات بكرێتەوەوزانستی روالّەت (سیمیایی) سێ رەهەندی



هەیە: نیشانە، سەرچاوە، شیكردنەوەو لێكدانەوە. كە هەر سێ رەهەندەكە لە ناوەندێكی تێگەیشتن دەبێت. ئەم روانینەی وشە بچووكترین یەكێتیی مانایەو هرمینۆتێكسی وشە بایەخێكی گرنگی هەیە كەمانای جێگیری نیسبی دەبێت.

(توسمان) زانای سیمۆلۆجیا دەڵێ: تاكە وشە مەدلوولی جێگیری هەیە ئەگەر ماناكان زۆربن یان كەم،ئەو تاكە وشەیەش گوزارشت لەمانایەكی نەگۆڕ دەكات وتایبەتمەندیی خۆی لەهەموو(كات- شوێن) دەپارێزێتو بەپێی تێگەیشتنی گشتی، كار دەكاتە سەر گەیاندن. وشە هەڵگری مانایەكی دیاریكراوە كە شێوەی دەناسرێتەوە پێی دەوترێت مانای ناوەندی لەگەڵ ئەوەشدا بۆ لێكدانەوەی دەروونی زمان چەندان مانای تری لاوەكی بەخۆیەوە هەڵدەگرێت ئەمیش گوتنە كەمانایەكی وێنەیی هەیە. ئەگەر تێبینی بكەین تاك وشە لەزماندا بەوە ناسراوە كەمەدلوولی زۆری هەیە. ئەو مەدلوولانە بەجیهانی دەرەوە (ژینگە) بەستراوەتەوە بۆ نموونە كە دەڵێن (زێڕ، ئاڵتون) واتە وەك كانزا باس دەكرێت فۆرمی ناو وەر دەگرین، وەك سیفەت بۆ باشەو چاكە و پێداهەڵگوتن وستایشكردن بە كەسێك یان بە كردەوەیەك بەكار دێت یان وەك ((كالاّ))دەنرخێنرێت یان وەك شتێكی بێ فرۆفێڵ بەكاردەهێنرێت. وشەی یەك دالی چەندان ماناو مەدلوولی پێ بەكاردەهێنرێت و گوتن و رستەو كات و شوێنی مەدلوولی دەگۆڕێت ئەمەش پێی دەوترێت ((زماناسی بەرهەمهێنەری گوێزەرەوە.)) گرینگی ئەو زماناسییە لە شیكردنەوەی پێكهاتەیی مانا دەبێتە هاوكێشەی دۆزینەوەی زمان، چونكە هەموو هێمایەك لەجیهانی دەرەوەو ناوەوە گوزارشت لە دالێك دەكات و هەموو دالێك نیشانەیە بە نموونەیەك لەدالی ئەگەری هاوشانی كرداری وشە. ئەوكاتە زمانی بەرهەمهێنەری بەكار نایەت كە بایەخ بە ئیستاتیكای زمان دەدات، رەهەندەكانی زمان بە ئەزموون دەكات.

وشەی مانا (مەدلوول) چوار فاكتەری سەرەكی دەبێت لە گوتندا، (ناوەڕۆك، چوونە ناویەك، تەواوكەری یەكتر (دال ومەدلوول)، پەیوەست بوون). ناوەڕۆك: واتە وشەیەك مانای وشەیەكی تر ببەخشێت لەهەمان شوێنی شیكردنەوەداو بۆ هەمان

مەبەست. چوونە ناویەك:دوو وشە هەمان مانا ببەخشن واتە دالێك دوو مەدلوولی هەبێت کەهەمان کرداری وشە لەگوتن و رستەدا بکات و یەك مەبەستی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا فۆرمی وشەکان لەیەکتر جیاوازبن. تەواوکەری یەکتر: دوو وشە لە فۆرم وەك یەك لەدوای یەکتردا لەرستەدا بەکاربهێنرێن، بەلاّم ببنە تەواوکەرو تەئکیدی یەکتر وەك (پۆل پۆل، دانە دانە، دوو دوو یان چوار چوار....) لە زماندا یەکێکیان ماناو ئەوی تر سێبەری ماناکەیە.

(پەیوەست بوون)یش:واتە وشەکان لە فۆرم سەربەخۆ مەدلوولێکی جیاوازیان هەیە، بەلاّم لەگوتن و نووسین و قسەکردندا بەمانایەکی ترەوە پەیوەستن. لە تۆژینگەی رەخنەی ئەدەبی نوێدا لە سیفەتی دەلالەتدا بەستراوەتەوە بەکرداری رەخنەگرتن کە چوار زاراوە لێك جیا دەکاتەوە بریتییە لە: مەدلوول واتە مانای دالی دەقی ئەدەبی، بۆچوون واتە مەیلی ئەوشتەی کە وشەکەی بۆ باس دەکرێ.

(هەست...(شعوور):هەستی ئەو کەسەی قسە دەکات بەرامبەر گوێگر یان هەستی رەخنەگر بەرامبە نووسەر،مەبەست واتە لێکدانەوەی باری دەروونی دەربڕینی ئەم وشەیە لەچ بارێکدا دروست دەبێت و ئامانج لەو دەربڕینە چییە؟، بەلاّم (چۆمسکی) جیاوازی لەنێوان سێ لایەنی مانا دەکاتەوە،

یەکەم: مانای سەرەکی ناوەندی واتە دەلالەتی سەرەکیی وشە.

دووەم: مانای جێبەجێکراوی کێشەزایی واتە لێکدانەوەی وشە بەبێ دەربڕین و شێوەی گوتنەکە.

سێیەم: ناوەڕۆکی سۆوی و هەڵچوونی واتە لێکدانەوەی وشەکان لەڕووی سایکۆلۆژییەوە بۆ مەبەستی گوزارشتکردنی مەدلوولەکان.

(لیچ)بۆچوونی ئەو لەسەر مانای وشەکان لەڕوانگەی پێکهاتەی رستەکان، رێکخستنی وشەکان، رەنگدانەوەی (کاردانەوەی) وشەکانیلێکدایەوەو تیۆری زمانی داڕشت و پێکهاتەی رستەکان واتە نووسەر سەربەستە لە هەڵبژاردنی وشەکان بۆئەوەی بارستلی و فۆرمی زانستی ببەخشێت ورێکخستن واتە دۆزینەوەی





پێوەندیی لەنێوان وشەکان کەمەیلی رێکخستنی لەگەڵ وشەیەکی تردا هەیە، ئیستاتیکای رستە دروست دەبێت و رەنگدانەوەی وشەکانیش واتە وشەیەك مانایەکی چاکی هەیە لەرستەدا، بەلاّم بەتەنیا مانایەکی نەگەتیڤی دەبێت و ئیحای سەلبی(نەریتی) دەردەبڕێت بۆئەو کەسەی وشەکان بخوێنێتەوە، دەلالەتی ناوەندیی وشەکان جێگیرن چاکتر لە مێشك دەمێننەوە بەتایبەتی لەسەردەمی منداڵیدا وەك وشەی (دار، رووبار، بەرد، چیا...)، بەلاّم دەلالەتی ناوەندیی گوتن جێگیر نییە کەمتر لە مێشك دەمێنێتەوەو چەمکی وشەکان بەپێی کات و شوێن وتەمەن وکەسایەتی و تێگەیشتن دەگۆڕێت وەك (چاکە، یەکسانی، خۆشەویستی، بەختیاری....) و زۆربەی خەڵك هاوبەشی دەلالەتی وشە دەکات، چونکە بۆ پەیوەست بوونی نێوانیان لێی تێدەگەن و بەئاسانی هەرسی دەکەن، بەلاّم دەلالەتی گوتن و پەراوێزی کەم کەس بەکاری دەهێنێت و کەمترین خەڵك هاوبەشی لە تێگەیشتنی دەکات،چونکە پەیوەستبوونی بە مێژووی زمان زۆر لاوازەو تەنیا لەسێبەری مەدلوولەکاندا دیاردەکەوێت،ئومیش لەبەر شەرمی دەروونی واتە نووسەر یان قسەکەر لەبەر هۆکاری دەروونی و کەسێتیی ناو کۆمەڵ وشە دەرنابڕێتیان بەکارهێنانی وشەی گونجاو لەرستەدا کەمانای گونجاوببەخشێت یان گشتگیری وشە بەکاردەهێنرێت لەجیاتی وشەی تایبەتی وەك (پیاو- مرۆڤ) مرۆڤ لەوشەی پیاو گشتیترە و مرۆڤ دالێکە مەدلوولی زۆری هەیە ئەبستراکت و هەستپێکراو، بەلاّم پیاو مەدلوولێکی دیاریکراوە بۆ مەبەستێکی سەرەتایی بەکاردێت، یان وشە هاوبەشی دۆزینەوەی وشەیەك بکات. لەنێوان دوو وشەی سەرەکیدا کەمانایەکی سەربەخۆ دروست بکات. (رۆلان بارت) لە تۆژینگەی زماندا سێ پێوەری بۆ سیمۆلۆجیا دیاری کردووە، یەکەم: گوتن خاوەن دەلالەتی ناوەندی کە مانایەکی ئاشکرای هەیە کە یەك بەردیدی هەیە بۆ تێگەیشتن. دووەم: ەگوتنی دوودەلالەتی وەك یەك لەڕووی هاودژ وەك وشەی (شێر) کەناوێکە بۆ پۆلینکردنی ئاژەڵ بەکاردێت،بەلاّم لەڕووی دژەکەی تر بۆ قارەمانیەتی و ئازایەتیی تاك

بەکاردەهێنرێت. واتە بۆ ستایش و پێداهەلگوتنی کەسێك دێت کەکارێکی ئازا بکات، بەلاّم دژەکەی ناوێکی ئاژەڵییە. سێیەم: گوتنی دوو دەلالەتی جیاواز لەمانا وەك یەك دوو وشەی لەیەکتر جیاواز، بەلاّم هەمان مەبەست بدەن بەدەستەوە نموونە (خۆتان مەکوژن) مەکوژن بەمانای تاوانی کوشتن دەبێ، بەلاّم هەمان مەبەستی هەیە کە دەڵێ خۆتان هیلاك مەکەن زۆر فشار لەسەر خۆتان مەکەن، دوو دەلالەتی جیاواز، بەلاّم یەك مانای فەوتانی جەسەدی و رۆحی دەگرێتەوە.سایکۆلۆجیستەکان دەڵێن تۆژینەوە لەفرمانەکانی زمان هەموو سنوورەکانی بابەتی ومانا و ئەبستراکیەت ولۆژیك دەبەزێنێ بەو مانایەی زمان ئامانجەکەی گوزارشتکردنە لە راستی، نەك هەر راستی،بەڵکو پەیوەستبوون بەهزرو گواستنەوەی فیکرە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی ترلە شوێن و کاتێکی تر بۆ مێژوویەکی تر، بەلاّم یەکێك لە ئامانجە گرینگەکانی زمان فرمانکاریی سۆزییە، واتە گوزارشتکردن لە سۆزو هەڵچوون و وروژاندنی هەست و گۆڕانی رەوشتی تاك بۆ هیرمینۆتیکای رەوشتی لەتاك و کۆمەڵدا.مانای هەر وشەیەك پێناسەی کولتورێك نییە ئەگەر لەژێر سێبەری مەدلوولی سۆزی و دەروونی نەبێت،هیچ وشەیەك گۆشەگیری زمان نییەو سەربەخۆ نابێت، چونکە هەموو وشەیەك لە وتنی زماندا بەکۆمەڵێك ماناو سۆزو هەڵچوونەوە بەستراوەتەوە کە هاوبەشی لەژیانی هزری و عەقلّی و کەسێتی مرۆڤدا دەکات و عەقلّی ناوەوەی ئەو کەسە ئاشکرا دەکات. (جاك لاکان)ی دەروونزانی فەرەنسی دەڵێ: هەموو وشەیەك لەبەردەم وێنەی هزری دادەمێنێت و لێکدانەوەی بۆ دەکرێت بە جیا لەمانای خۆی،واتە کاتێ ناوی کەسێك دەڵێن کە نەبینراوە وێنەیەکی چەند شتمان بۆ دەردەکەوێت،بەلاّم کاتێ دەیبینین یەکسەر بۆچوونەکانمان دەگۆڕێت، واتە وێنەی هزر جیا دەکرێتەوە لەمەدلوولی دالی خۆی. ئایتمێکی تر (عنصر)هەیە لەزمان ئەویش کاریگەریی سۆزو ویژدانە لەگەڵ لەرینەوەی دەنگ و هارمۆنی و ڕێزبەندی وشەکاندا و هەڵبژاردنی وشەی گونجاو ئەمانە هەموویان کارێکی سایکۆلۆژی دەکەنە سەر بەرامبەر (دال) کە پێی دەوترێت هێمای دەنگەکان و باری





دەروونی تاك راستەوخۆ کار دەکاتە سەر مانای وشەکان و کاریگەرییەتیی کەسایەتی و پەرچەکردار کە بەو کەسەوە بەدی دەکرێ،هەموویان کاری خۆیان دەکەنە سەر وشەکان بەشێوەی ئەرێتی و نەرێتی کە پێوەندی بە سایکۆلۆژیەتی تاکەوە هەیە، ئەم بیردۆزەیە پێی دەوترێ سیمۆلۆجیای دەروونی.

پێوەندیی نێوان دەروونی و دەلالەتی وشەکان لە بواری تاکدا وەك پێوەری جیاکاری و جیاوازی لەلێکدانەوەو تێگەیشتنی مانا دەروونییەکان. (دی.سوسێر) دەڵێ: لەزماندا هەندێك ئەگەری دەلالی هەن وەك کەسایەتی و هوری ئەبستراکیەت و هۆشیاری کە ناتوانرێت بەپێی تێبینیکردنی ژینگە و گۆڕانی رەوشت بڕی مانای زمان دیاری بکرێت،چونکە پێوەندیی دیالۆگی لەنێوان وشەکان و شتەکانی دەورووبەردا هەیە واتە وشەکان هەڵگری مانای ئاڵۆزو شاراوەن ناتوانرێت ئاشکرا بکرێن تەنیا لەرێگای تێبینی بەکارهێنانیان دەتوانین ناوەڕۆکی ماناکان ئاشکرا بکەین، مانای ئەوەیە رواڵەتی وشەکان لە هیرمینۆتیکای زماندا ئەوە دەگەیەنێ چۆن لەزماندا بەکاردەهێنرێت، رێگای بەکارهێنانی، دەوری لەزماندا چییەو چی دەبێت؟.ئەمانە پێیان دەوترێت زانستی رواڵەتی وشەکان کە چەند جۆری هەیە وەك رواڵەتی زمان و سۆزو هەڵوێست ورۆشنبیری. ئەمەش پێی دەوترێت ریزبەندی وشەکان، کاتێ دەڵێین،کانزاکان واتە کۆمەڵێك مەدلوولی ریزکراو دەگەیەنێت بێئەوەی دەریانبخەین یان کاتێ دەڵێین ئاژەڵە شیردەرەکان یان گۆشتخۆرەکان یان دەوڵەتی خۆرهەلاّتی ناوەڕاست راستەوخۆ چەند مەدلوولێکی شاراوە ئاشکرا دەبێت بیرخەرەوەیەکی هزری دروست دەبێت بۆ ریزبەندی وشەکان و هەر ژینگەیەك و کەسایەتیی کۆمەڵ دەلالەتی جیاواز دروست دەکات.

بەپێی سایکۆلۆژیەتی ئەو گروپ و ژینگەیە مێژووی زمان لەوە دەستپێدەکات کاتێ زمان پەیوەستی دەلالەتی ئەو بابەتانەی دەورووبەر دەبێت و گوزارشت لە حاڵەتی دەروونی تاك و کۆمەڵ دەکات بۆ لەیەکتر گەیشتن. لەم رووەوە (چۆمسکی) دەڵێ: کاتێ هەموو دەلالەکان لەهەموو زمانێکدا وەك یەکن واتە رێسای رێزمانیش وەك

یەك دەبن بۆیە بۆ شیکردنەوەی زمان مانای دالەکان لەپێش ڕێزمانەوە دەبێت تەرکیز کردن لەسەر پێکهاتەی رستە سازی (سینتاکس) بۆ ناوەڕۆکی دەلالی. ڕێباوی بونیادگەریش لەزماندا لەدوای ڕێزمان و پێکهاتەی سینتاکسی زمان بایەخیان بەلایەنی دەنگ و فۆنەتیکی وشەکان دا کە شیکردنەوەی سایکۆلۆژییان بۆ لەرینەوەی هەموو دەنگەکان کرد هەروەها چۆنیەتی کاریگەری لەسەر بەرامبەرو ژینگەدا.

رستەیەك فۆنەتیکی هارمۆنی زیاتر کاردەکاتە سەر بەرامبەر بۆ وروژاندن و تێگەیشتنی خێرا لەو رستەیەدا کە فۆنەتیکی لاوازو هەراو هۆریای لەگەڵدا بێت و پێشەنگی ئەم قوتابخانەیەش (ساپیر و هارس) بوون ئەمەش گورزێك بوو لەقوتابخانەی لاسایی کەرەوە درا کە دەڵێن دەلالەتی زمان هۆیەکە لەشیکردنەوەی زمانی کۆتایی،بەڵگەش بۆ ئەمانە قوتابخانەی لاسیی کۆن بایەخی سەرەکییان بەزمانی بەرجەستەی سروشتی دەدا لەوێوە دەستیان بەهیرمینوتیکای زمان کرد وەك دەنگی بەردو هاژەی رووبارو وژە وژی با کە دالن بۆ تێڕامانی مەدلوول لەرێگای ئەوئەرکەی جێبەجێ دەکەن تایبەتمەندی دەبەخشن بەزمان لەرووی رێکخستن و جوانکاریو سینتاکس لەو ساتانەدا بیردۆزی قوتابخانەی گۆێزانەوە (تحویلیە)سەری هەڵدا کە زانستی زمانی لە پرۆسەیەکی فێربوونی زمانەوە بۆ فێربوونی پرۆسەی زمان گۆڕی و ئەمەی دووەم پەیوەستێکی هەبوو بەرامبەر فەلسەفەی فێربوونی زمان کە جەختی لەسەر پێکهاتەی هزری واتەمانای زمانەوانی دەکردەوە، ئەمیش بەبۆچوونی (چۆمسکی) هۆکارێکی سەرەکییە بۆ جێگیربوونی سروشتی پێکهاتەی نەتەوایەتی و کەسایەتیی نەتەوەیی کەناوی ناوە (دەم و دووی زمانەوانی) ئەمیش جیاوازییە لەنێوان وشە و زماندا کەزمان کۆمەڵێك یاسای گشتییە لەعەقڵەوە سەرچاوە دەگرن، بەلاّم وشە هێمای دەنگی بەرجەستەیە کەلەنێوان گوتن و بیستندا دەگوێزرێتەوەو لە فۆرمەلەبوونی خۆیدا ملکەچی یاسای دەماغ دەبێت. قوتابخانەی بونیادگەری لە ههڵانی پەنجاکاندا مانای (دەلالەتی) زمانی



فەرامۆش کرد بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو فەرامۆش کردنە قوتابخانەی گوێزانەوە سەری هەڵداو دووبارە دەلالەتی زمان سەرکەوت و لەهەمان بۆچوونەوە تیۆری پەیوەست بوون دەرکەوت کە بایەخی بەفرمانی پێکهاتەی زمان دەدا بۆ بڕیاردان لەسەر نزیکایەتی کۆمەڵ کە (شتراوس) ناوی ناوە خزمایەتیی کۆمەڵگەو تیۆری پەیوەستبوون جەخت لەسەر زمانی بەکارهاتوو لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵ دەکاتەوە نەك لێکۆڵینەوەو راڤەکردنی دیاردەکانی بەردیدی (عینی) زمان لەرێگای رۆشنفکری عەقڵ بۆ سێنتاکسی زمان ئەمەش لە رێگای سێ (ئایتم) ی سەرەکی زمان دەبێت (رێزمان و مانا وبەکارهێنانی).

(سوسێر) باس لەبەهێزی زمان دەکاتەوە لەسەر ئەرکی دەمودووی زمان، چونکە بەهێزی زمان تەرکیز لەمێشکەوە دەبێت بەهۆی ئەندامە فەسلەجییەکانی قسەکردن،بۆ بەهێزبوونی مەرجەکانی بە کۆمەلاّیەتی بوون لەرێگای زمانەوەو تێگەیشتنی دەمودووی زمان لای (چۆمسکی) بایەخ نەدانە بەکارلێکراوەکانی کۆمەلاّیەتی لەگەڵ فەرامۆش کردنی باری گونجاوی دەوروبەری ژینگەدا کە بەکاردەهێنرێت.ئەمەش بەرهەمهێنەری سیستەمێکی دیاریکراوە لەرەوشتی زمانەوانی کەفێربوو بە پاڵنەری گوزارشتکردن لەخود بەکاری دەهێنێت بۆ پێوەندییەکانی کۆمەڵ لەگەڵ تاکدا سایکۆلۆجستەکان ئەگەری ئەوە دەردەخەن کەفەلسەفەی زمان زانستی زمان و سیمۆلۆجیا پێوەندییەکی ئاسانکاری لە نێوان گوتن و زمانە تایبەتییەکەی خۆیدا هەیە کە فاکتەری دەرککردنی دەوروبەرە لە روانگەی (مۆنۆلۆگ)دا ئەو بەشەی ئەپستمۆلۆژیای زمان هەموو دیاردەکانی قسەکردن و (سینتاکس)ی زمان کە بە (زمانی تەواو) ناوبراوە دەگرێتەوەو دەکەوێتە بەرامبەر هاوکێشەی فیزیای تاك کە بەیەکەوە مێژووی دالی زمان تەواو دەکەن.

زمانی ئایدۆلۆژی و نەتەوایەتی و زنستی و کۆمپیوتەر پۆلین کراون و بەهۆی جەربەزەی مێژووەوە ئەم فۆرمە دابەش کردنە دیالیکتێکە بۆ سەرهەڵدانی

گرووپەکانی کۆمەڵ و پاراستنی سایکۆلۆژیەتی تایبەتمەندی دروستبوونیان زمانی تەواو لە سیستەمی زمانەوانیدا هێزێکی بەرهەمهێنەری ژسانی زمان هەوڵی ئەوە دەدات کە ناکۆکیی زمان لە زماندا نەمێنێ وهێزی یەکانەتی هزری ئایدۆلۆژیی گوتن دروست بێت بەمەش زمانێکی چەسپاوی نەتەوایەتی پەیدا دەبێت...

لێرەدا شیکردنەوەی دەروونی ئەوە دەردەخات کە ڕادەی زمانی ڕووتەڵە کەپێی دەوترێت (هێمای زمان) ببێتە تەوەرەی سەرەکیی شیکردنەوەی مێژووی زمان، چونکە لەرووی سایکۆلۆژییەوە هەرگیز پێوەری زمان بەوە نەکراوە کەوا سیستەمێکە لە پۆلێنکردنی (سینتاکس)ی زمان، بەڵکو سایکۆلۆجستەکان وای هەڵدەسەنگێنن کە زمان پرۆسەیەکی تێرکراوی ئایدۆلۆژیایەکە وەسفی بۆچوونی گشتی جیهان دەکات و تێگەیشتنێکی هاوبەش لە هەموو بوارەکانی ژیان کە زمانی زیادەی گوزارشتکردنی لەهێزی کاری ئایدۆلۆژیەت دەکات بە مەیلی ناوەندی پێشکەوتن لەگەڵ ناوەندی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ڕۆشنبیری، ئەمەش سێبەری زمانە تایبەتمەندییەکانە کەلە تایبەتیەوە بۆ گشتی دەبێت لەومانی دایکەوە بۆ زمانی جیهانگیری و ئەنتەرنێت. ئەتۆژینگەیە بەرامبەر فەلسەفەی زمانی گەلان، چونکە هێزی ڕاکێشان لە ژیانی زماندا بەزمانی تەواوکراو بەستراوەتەوە کەکار بۆ جیاوازیی زمانەوانی دەکات نەك بۆ دابەشکردنی زمانی دیالێکتیکی تەنیا دابەشکردن بۆ زانستی فۆنۆتیك کە زمانێکی وێژەەی پاراوە لە کۆمەڵ و زانینی ئەو دابەشکردنە زمانەکان بەزیندوویی دەپارێزێ، چونکە تریەی زمان و پرۆسەی نامەرکەزی لە بەکارهێنانی زماندا یەکێکە لە ڕەهەندەکانی یەکگرتووی ناوەندی ئایدۆلۆژیای- وتن،بەڵام ئایتمی هەرە گرینگ ژینگەی فرە ڕەهەندە کە تایبەتمەندی دەبەخشێت بە زمان و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان بەکاری سیمۆلۆجیا پەیوەندار دەبن، چونکە زمانی گێڕاوە (محکی) بڕین ولابردنی زمانەکانە و دەیکاتە کۆیلەی زمانەکانی تر کە وشەی ڕاستی ڕۆشنفیکری ناهێڵێت.





جیاوازی نێوان زمانی ڕەگەزەکان بەهێزترین جیاوازییە بۆ لە یەکتر گەیشتنی زمانی شارستانییەت و ئاڵوگۆڕی شارستانییەتی گەلان بۆیە تێکەڵاو بوونی ڕەگەزەکان زمانێکی گشتی جیهانی دروست دەکات. دایەلۆگ خێراتر دەبێت و ڕەوشتە دەروونییە تاکەکان سیفەتی گشنگیری وەردەگرن، تەنیا بە دایەلۆگ زمانە تایبەتی و ناوچەییەکان سیفەتی گشتی وەردەگرن سایکۆلۆجستەکان دەڵێن زۆرجار ڕەوشتی پێوەندیکردنی ئاژەڵ هاوبەشی پرۆسەی زمانی مرۆڤ دەکات کە بە نیشانەکردن دیار دەکرێت واتە لەتوانای مرۆڤدا هەیە گفتوگۆ بکات یان باس لە شت بکات کە دووربێت لە کات- شوێنی ئەو شتە باسکراوەیە، بەهۆی نواندتی ڕەوشتی تایبەتی دەرچوو کە گوزارشت لە شتێکی نادیار دەکات بۆ وەمەنێکی هەنووکەیی

زمانی مرۆڤ بەدەر لە کاری بایۆلۆجی لە پێکهاتەی ناوەرۆکیەوە، بەهۆی پێشکەوتنی پێوەندییەکانی تاك زمانیش پێشکەوت لە دیدگای شارستانییەتی پێویستسەکان، چونکە ڕەهەندەکانی زومونی دیکارتی بەرامبەر سیمۆلۆجیا بەسەرچوو جۆرێك لەپێوەندییە ئامێرییەکان لەسەر ئاستی زمانی سروشتی بەڕێوە دەچێت خۆی لە گرامەرو سێنتاکس پاراستووەو کاری ئاسانی و خێرایی زیاتر دەبێت لە بۆچوونەکانی (دیکارت) بەرامبەر ڕەوشتی زمانی سروشتی. لەزەمەنی ڕابردوودا زمان تایبەتمەندیی بێ کۆتایی هەبوو کە بۆچوونێکی بیرکاریانەبوو بەرامبەر زمانی نووسین، ئەم هزر خوازییەش لای ((گالیلۆ)) گەلاڵە بوو و وتی زۆرترینی بیرە نهێنییەکانی مرۆڤ بەرامبەر هەر کەسێك بە (٢٤) هێمای بچووك دەردەبڕێت. کەگەورە ترین داهێنانی مرۆڤایەتییە و زمان حاڵەتی دەربڕینەو نوادنی ئەو هێمایانە،ئەمەش دەربڕینێکی بێ سنوورە کە بتوانین ئەوەی بیرلێ دەکەینەوە و هورمەندی دەکەین بە کەسانی بەرامبەری ڕابگەیەنین کە خۆی لەخۆی پێشکەوتنێکی بایۆلۆجییە بە پێی ئەندازەی جینەکان. ئەندامەکانی زمان وەك هەموو ئەندامەکانی لەش ڕواڵەتی سەرەکیی کرۆمۆسۆمەکانە بەهۆی دووکارلێکی

فاکتەری عەقڵ وەك حاڵەتی بیرکردنەوە وەرگرتنی زمانە بە گونجان لەگەڵ دەورووبەردا،بەلاّم بەردەوام بوونی زانیارییەکان وەك چوونە ژوورەوەی مێشك دیاردەکرێت کە تەواوکردنەکەی هاتنە دەرەوەی زانیارییەکانە لەکاتی پێویست لەڕێگای زمانەوە،ئەمەش بەشی ناوەوەی بایۆلۆجی زمانە و ئایتمی ژینگە هاوبەشی دروستبوونی زمان دەکات کە تایبەتمەندیی ژینگەی خۆی دەپارێزێت هەر ئەو ژینگەیەش سیفەتێکی دیاریکراو دەبەخشێت بە زمانی خۆماڵی یان زمانی زگماك، ئەو کاتە دەوڵەمەندیی زمان و زۆری فاکتەری زمان بەهۆی ڕەهەندەکانی ژینگەوە دیاری دەکرێت،بەلاّم پرسیار ئەوەیە ئایا میکانیزمی دەماغ چ کار دەکاتە سەر پاراستکی زمانی دایك بە چ فاکتەرێك ژینگەی زمان دەگۆڕێت، چونکە ڕەهەندەکانی مێژووی میکانیزمی دەماغ دەوەستێتە سەر زمانی دایك دەبێتە سێبەری وتن، بەپێی (چۆمسکی)تێکەلاّویی خەڵکانی بێگانە یەکەم زەنگی گۆڕینی ڕەوشتی سایکۆلۆژیەتە کەزمانی بێگانەو دەورووبەر وەرگرین ڕەهەندەکانی مانەوەی زمانی دایك لاوازتر دەبێت.بەپێی ئەم تۆژینگەیە وەلاّمی پرسیارەکە هەڵدەسەنگێنین دەبێ زۆر بە تایبەتمەندییەوە بڵێین،زمان چییە؟ چۆن لێکۆڵینەوە بکەین؟ پێکهاتەی سروشتی دروست بوونی بایۆلۆجیەتی زمان لەناوەووە چییە؟ کاری مێشك و سایکۆلۆژیەتی کۆنترۆڵکردن چین؟ ئایا بوونی کۆمەلاّیەتی بەزمان دیاری دەکرێت و مەرجی سەرەکی بە کۆمەلاّیەتی بوونە یان بوونی زمان پێکهاتەی نەتەوە دروست ەدەکات؟ سروشتی پێکەوە ئاخاوتن بەیەك شێوە چییە؟ ڕەوشتەکانی یەك گۆکردن چییە؟ بەلاّم نیتۆدی ئەموردکارییە لێکدانەوەی ئەپستمۆلۆژیای هەموو میتۆدەکانی زانستی لۆژیکی مرۆڤایەتییە.زمانێکی تاکە کەس کە حالەتی بوونی ئەو کەسە لەوژینگە فرەوانەدا دەسەلمێنێ و بەپێی هیرمینۆتیکا ناساندنی مرۆڤ لەسەر بنچینەی بەزمانی بوونە؛ واتە ئاخاوتن و وتن بەزمانی ئەو کەسە دەبێت، کە دیالیکتیکی مێژووی لەسەرهەڵدانی زمانە تایبەتییەکان کەوتە ململانێ، بەلاّم پێش سیمیایی مێژووی زمان زەمەنێکی سەرەتا بوو. دروستبوونی سێنتاکسی بەرهەمهێنەر لە



فۆرمەلە بەندی زماندا ناونرابوو شۆڕشی زانین. ئەم ئاڵوگۆڕە لە دیدگای ئالیەتی لێکۆڵینەوەی ڕەوشت و ئەنجامەکەی توانی بچێتە ناو بیرکردنەوەو پەرچەکردارەکانی مێشك،بەلاّم ئەو بۆچوونە هیچ کاتێك گۆڕاوەکانی ڕەوشت و ئەنجامەکانی مەبەست نەبووە،بەڵکو تەنیا تۆژینەوەیەکی ڕێگا چارەبوو بۆ شیکرنەوەی میکانیزمی پرۆسەی زمانی لە کارلێکەکانی مێشك بۆ جێبەجێ کردنی کردارەکان و لێکۆڵینەوەیان بەرامبەر بەدیاردەکانی دەورووبەر لەگەڵ شیکردنەوەی میکانیزمی ناوەوەدا کە گوزارشتەکان لەوێ سەر هەڵدەدەن، گەڕانەوەی ئەپستمۆلۆژیا بۆ نێو لێکۆڵینەوەدا نوێکاری و پێکهاتەی تازەی خستە نێو زمان ئەویش بەکارهێنانی بێ سنوور بۆ هۆیەکانی پەیوەست بوونی دیاریکراو، چونکە زانستی زمانی ئەنترۆپۆلۆژیا تێگەیشتنێکی سروشتی بووە بەرامبەر جۆرەکانی زمان، کە ئاطنجی سەرەکیی دیالیکیکی زمان دۆزینەوەی تێگەیشتنی پێکهاتەی زمان بووە لە عەقڵی گوتراودا کە فەزایەکی سەربەستانە بۆ دەربڕین لە فاکتەرەکانی ڕێکخیتنی ژیانی ڕۆژانە ،بەرامبەر بەرهەمهێنان و تێگەیشتنە، هەمان مەبەست دەتوانرێت لێکۆڵینەوە دەربارەی وەرگرتنی زمان لە قۆناغی سەرەتایی بکرێت، چونکە منداڵ زیاتر دەزانێ لەوەی فێردەکرێت، منداڵ وشە فێردەبێت بە تێکڕای یەك وشە لەهەر کاتژمێرێك و زمان وەك ئەندامەکانی تر لەمنداڵ بەپێی زەمەن گەشە دەکات،واتە گۆڕانێکە لە منداڵ ڕوودەدات نەك منداڵ ئەو گۆڕانە بکات و بەدوای مانای وشەکان بگەڕێت بۆ ئەوەی کیانیان دروست بکات، بەلاّم هیچ گۆڕانێك دەربارەی سێنتاکسی بەرهەمهێنەری وشەکان ڕوونادات کە زمان ئۆرگانێکی ئاڵۆزی ڕێزمانە کە پێکهاتەی سینتاکسی دیاری دەکات، لەهەندێ زمانیشدا دەبێتە پەیوەستبوون یان دەربڕینی کردارەکی یا مانای شاراوە یان ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی مەبەست.کاری دەماغ ئاشکراکردنی تایبەتییەکانی زمان لەژێر کاریگەریی زانیاری وەرگیراوە، ئەمەش یەك زنجیرە کرداری زگماکی مێشکە، چونکە زمان پلەی سەرکەوتن و پێشکەوتنی مێشکی مرۆڤە، بەلاّم لۆژیکی دەماغ لەپرۆسەی

زمـاندا چـەند تۆژیـنەوەیەکی خـێرا دەکرێـت بەرامـبەر کارۆگـرافی مێشـك بـۆ دیاریکـردنی شـەپۆڵەکانی دەمـاغ لـەکاتی وتـن و لـێکدانەوەی وشـەکان چـونکە کارۆگـرافی مێشك جۆرەکـانی میکانـیزمی زمـان ئاشـکرا دەکات، ڕەنگـە ئـەم کـرداره بـەرەو ئالیەتـێکی تـر بـڕوات کـە تـێڕامانی هەنووکـەیمان وەلابنێـت زمـانی وتـن ئاڵۆزتـرین کـرداری گۆڕانکاری ڕەوشـتی تاکـە بەرامبەر خود و کۆمەڵ، بەلاّم کێشەی سـەرەکیی گونجانی پرۆسـەکانی عـەقڵ و بەدەنـە لـەکاتی بـە زمانیـبوونی هزرەکانی دەورووبـەر،چونکە پرۆسـەکانی عـەقڵ واقیعی فیزیاوییە کە پێش هەست (حدس) ئامـادەیی بـۆ کـراوە،بـەلاّم بـەدەن ئەنجامی ئەو واقیعەیە کۆتایی بە پرۆسەی زمانی تـاك دێنێـت کـە سـرووش لە مێشك وەردەگرێت، وێنەی زانستی کێشەزای فەلسەفەی میکانـیکی بەپشت بەستن بە کەرستەی خاوی یادگەی ئامادە بۆ کار لێککردن بەپێی هەڵوێستی دەورووبەر لەکاتی پەیوەستبوونی تاکەکانی کۆمەڵ لەگەڵ یەکتریدا. وەك (نـیوتن)زمـان دەگەڕێنێـتەوە بـۆ تازەتـرین سـیفەتی مـاددە لـە بەرزتـرین پلـەی ئـاڵوگۆڕی لەگـەڵ ماددەکـانی تـردا مـاددە لـە سـەرکەوتووترین چالاکیی خۆیدا زمان دروسـت دەبێـت و دەکەوێـتە چـالاکی لـە سـنووری تەنۆلکـە جوولاّوەکـان، بـەلاّم (چۆمسـکی)ئەمـە ڕەت دەکاتـەوە زمـان دابڕانـێکی میکانـیکی نیـیە بەپـێی یاسـای ئەبستراکتی ماددەکان کار بکات، بەڵکو فراوانترین و لۆژیکترین لقی ئەپستمۆلۆژیایە. کـە بەرهەمهێـنەری میکانـیکی فەسلەجیی عەقڵە. سایکۆلۆجستەکان دەڵێن: لەکاتی تۆژیـنەوە لەبەکارهێـنانی زمـاندا دەبیـنین شیکردنەوە لـە ڕێگای فاکتەری پێکهاتەی مـاددی یـان نەخشـە سـازی یـان بەکارهێـنانی مەبەسـت و جـیاکراوە یـان دەوری دەزگاکـانی بەرهەمهێـنەری وشـە دەبێـت، ئـەو کاتـە دەلالـەتی وشـەکان بـۆ بنچینەی دروسـت بوونـیان دەگەڕێـتەوە بەپـێی بەکارهێنانـیان کـە تایـبەتمەندیی دەلالی جـیا دەبێـتەوە لـە تایـبەتمەندیی دەنـگ و فۆنەتـیك وا دابنـێین دوو دانـە چیرۆکی (گوڵی ڕەش) هەیـە. کەسـی (أ) دانەیـەکی لـەو چیرۆکە بردو کەسی (ب) دانەکەیتری برد. ئایـا هەردوو کەسـەکە یـەك جـۆر کتێبـیان بـردووە یـان دوو کتێبی جیاواز؟ لەڕووی





سێنتاکسـی زمانـەوە ئەگـەر بـەرورد بکرێـت لایەنی فاکتەری ماددی ئەوا دوو کتێبی جـیاواز بـووە،بـەلاّم لـە ڕووی سـیمیایی پـێکهاتەی دەلالیـیەوە ئـەوا یـەك جۆر بووە، بـەلاّم لـەڕووی هەرسکردنـەوەی لەیەکتر جیاواز بوون. دەروونـزانەکان هەردوو لایانی مـاددی و دەلالی وەردەگرن لەیەك کاتدا بۆ لێکدانەوە دوا ڕەوشتی کەسەکان لە وتن و دەربڕیـندا لـە پـێکهاتەی کەسایەتییەکی گۆڕاو واتـە دەتوانین وشەیەك تێکبدەین و لـەکاری بخـەین لـە شـوێنی ئـەو وشەیەکی تری وەرگێڕاو  یان دروستکراو دابنێین، لە ڕووی فـۆرم و سـیمیادا جساوازن لەکات و شوێنی مێژووی دروست بوونیان جیاوازن، بـەلاّ لـەڕووی نـاوەڕۆك و دەلالەتـەکان هـەمان کـاری میکانـیزمی عـەقڵ دەکـەن و جووڵـەی جەسـتەی دالەکان دروست دەکەن. کاتێ باسی وشەی (زێڕ، ئاڵتون) دەکرێت لـەڕووی سـەرەوەدا تەنـیا بەکارهێـنراوە بەرژەوەندیـیە مێژوویـیەکان ڕەچاو کـراوە، بـەلاّم لـەڕووی نـاوەوە سایکۆلۆژیەتی کۆمەڵێك دەلالەتی جیا لێکدەدرێتەوە لەکات و شـوێنی جـیاوازدا. بـۆ نموونـە:کاتـێك پەرداخێکی نیوە پڕ لە ئاو لەڕووی ماددییەوە دەتوانـین بڵـێین ئـەو پەرداخـە نـیوە پـڕە بـە هـەمان بۆچـوون دەتوانـین بڵێین نیوە بەتاڵـە هەردوو بازنەی ماددی تەواوە لەڕووی زمانی فیزیاوییەوە، بەلاّم کاتێ دەڵێین پەرداخـە نـیوە پـڕئاوەکەم خـواردەوە هـەموو دەلالەتـەکان کۆتایـیان دێـت، نـیوە پـڕ وجودی نامێنێـت لـەڕووی مـاددی و دەلالەتـەوە، بـەلاّم نـیوە بەتاڵ بەردەوام دەبێت، لـەڕووی ماددییەوە دەبێتە هەموو،هەم بۆ مانا ماددییەکە هەم بۆ مانا دەلالییەکە و درێژکـراوەی زمـانی وتـنە، پەرداخەکـە بەتاڵـە، دەتوانرێـت لـەڕووی زمانـەوە ڕەهـەندەکانی شـیکردنەوە دیاربکرێـت، واتـە خـەڵك بیردەکاتـەوەو لێکۆڵیـنەوە دەردەبڕێـت بەرامـبەر جیهانی دەورووبەر لە ڕێگای هەستی بینینەوە کە سەرچاوەی عـەقڵی مـرۆڤە لەگـەڵ مانایزاراوە بەکارهێنراوەکاندا کە گوزارشت لەبۆچوونی تاك دەکـەن و دەتوانرێـت ئـەم کـردارە بکرێـت لەگـەڵ نواندنـی دەنگدا بـەراورد بکرێـت زۆربـەی فەیلەسـوفە هاوچـەرخەکان لـێکدانەوەیەکی جـیاوازیان بـۆ زمـان و عـەقڵی لۆژیك هەیە،بەلاّم هەردوو تەوەر پرسیاری ئەوە دەکەن وشە نیشانە بەچ دەلالەتێك

دەکات کە وەڵامی جیاوازی هەبێت لێکدانەوەی فراوانی هەبێت، ئەمەش لەڕووی سایکۆلۆژییەوە لەسەر ئەوە پێوەری وشە کراوەکە وا چۆن سیفەتە دەلالییەکان بەکار دەهێنین کاتێ بیردەکەینەوە یان دەئاخڤین ئەوا بەشێوەیەکی گشتگیر بەهەموو بەکارهێنراوی زمان کیانێك دروست دەکەین لە فەزای جیهانی ئەپستمۆلۆژیادا.

سێنتکیی بەرهەمهێنراو هەوڵی دۆزینەوەی میکانیزمی بەکارهێنراو دەدات بۆ بەکارهێنانی لە شێوازی ژیانی ڕۆژانەی تاك کاتێ دەڵێین چوارگۆشەی میکانیزمی بینین لەڕێگای عەقڵوە نیشانە بە کتێب یان بۆکس یان شتێکی تری (مجسم) دەکات ئەمەش کارێکی گشتییە لە ئاسانترین پرۆسەی مێشکدا ڕوودەدات، بەڵام کاتێ نیشانە بە ناوەڕۆك و دروستبوونی مەبەستی چوارگۆشە دەکەین ئاڵۆزترین پرۆسەی مێشکە بۆ هیر مینۆتیکا و ڕوونکردنەوەی دەلالەتە شاراوەکان کە نایابترین ڕەنگدانەوەی میکانیکی مێشکە بۆ پێناسەکردنی دەورووبەر کە لە گیانەوەرەکانی تر بەدی ناکرێت.مرۆڤ کەمترین فەزا لەخەیاڵی زماندا داگیر دەکات؛ واتە پانتایی دەلالەتی زمان فراوانترە لەپانتایی ماددی مێشك نەك لەکاری زماندا، بەڵکو لە ڕەهەندەکانی سیمیاییدا کە فاکتەرەکلی وتن ڕێك دەخات بە جۆرێك لە سێنتاکسی زماندا دەبێتە وتاری بێژراو لەم کاتەدا دەتوانرێت زمان بەشێوەیەکی هەڵە بەکاربهێنرێت بۆ ڕازی بوونی بەرامبەر کە پێی دەوترێت فێڵی میکانیکیی بەرگریی زمان، چونکە کردارە زمانییەکان لەئاخاوتندا هاوکاری پەیوەستبوون دەکات بۆ فۆرمەلە بوونی بەرهەمی وتاری تاك واتە تێگەیشتنی چوون یەك لەنێوان دوو دایەلۆگدا بەهۆی نیشانە بەکارهاتووەکان وەك تێکستی نووسراو لەگەڵ پێوەندیی نیشانەکان لەنێوان نووسەر و خوێنەردا بەدرێژایی مێژوو زمان لە ڕووی بەکارهێنانییەوە کە واقیع دەرکی پێ دەکات لە یەکتر جیاوازن ئەمەش کێشەی دروستبوونی کایەیەکی پێچەوانە لە نێوان لەیەکتر گەیشتنی زمانەکانی جیهان دروست دەکات وئەوە دەگەیەنێت کە ناتوانین تەرجەمەی شارستانیەتەکان وەك خۆی بکەین لەبەر دووریی سێنتاکیی زمانەوانیدا،





بەڵام دەتوانرێت کارلێکی شارستانیەتەکان بکەین، چونکە کۆمەڵێك فاکتەری سیمیایی هاوبەش هەیە کە هەموو گروپێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکات کەبە دوای ئاراستەی چوونیەك کار دەکات ئاراستەی ناو ڕۆشنبیری گەلان لەگەڵ ئاراستەی نێوان ڕۆشنبیرییە جیهانییەکان بۆ لەیەکتر تێگەیشتن و ئاڵوگۆڕی شارستانیەت و گەشەی ستوونی ڕۆشنبیری بەهۆی زمانی حاڵی بوونەوە. (ف.دی.سوسێر) ئەم هاوکێشەیە بەوە پێناسە دەکات کە بەیەك گەیشتنی دال و مەدلوولە، کاتێك لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا یەك دەگرن لەیەکتر قووڵ دەبنەوە. ئەمەش جیاکاریی نێوان زمان و وتنە کە دەبێ نموونەی وتن لە زمان دەربهێنرێ. کاتێ سەیری زمان دەکرێت بە کۆمەڵێك هێمای بەردەوام بۆ پەیوەستبوون (تواصل) هاوسەنگ دەکرێ. واتە سیمۆلۆجیا لێکۆڵینەوەی زمان دەبەزێنێ و شێوازی تر لە بەرهەمهێنەری مانا لە ڕۆشنبیرەکان دەگرێتە خۆ لە شیکردنەوەی دەروونیدا، جیهانی تاك بە زانستی نیشانە گەمارۆدراوە کە کرۆکی کارلێکی کۆمەڵایەتییە کاتێ پێویستمان پێی هەبێ ئەمەش سیستەمی پۆلین کردنە. گرنگیی نیسانەکان ڕۆشنگەریی تێگەیشتن باز دەدات،بەڵام پێکهاتەی نییە تەنیا ئامرازی بەیەك بەستنەوەی بابەتەکانە وەك گشتی بەستراوەتەوە بە دال و مەدلوولەوە هێزی ماناگەری گەورە بەخۆیەوە دەگرێت وەك لەوەی لە چ بەشێ پێکهاتبێ واتە ئەو مانایەی گشتگیر هەیەتی هەمان مانا نییە کەوا بەشەکان هەیانە لە ڕووی ڕستەسازی زماندا. (ڕۆلان بارت) لە شیکردنەوەی میتۆلۆجیادا سیستەمی سیمیایی ناوەندی بەکارهێنا بۆ بەڵگەهێنانەوە سیستەمی سیمیایی ون بوو. (بارت) هەوڵی ئەوەی داوە لەشیکردنەوەی میتۆلۆجیادا تێگەیشتنی سەرەتایی بدات بەدال کە مامەڵە لەگەڵ یەقین دەکات. لەگەڵ سیمیایی بێت لەو کاتەدا دال و مەدلوول دەبن بەیەك بۆ دەرخستنی ئەو نیشانەیەی کەوا هەڵگری مانا راستییەکەیە بۆ بەدەستهێنانی مانای سێبەر ئەمەش هێزی نیشانە مانایەکی تری بۆ دروست دەبێت؛ واتە هەر چەند دال و مەدلوول مامەڵە بکرێت بەیەکەوە ئەوا مانای نوێی زیاتر دەست دەکەوێت کەبەهای نیشانە زیاد دەکات واتە

لێرەدا سیمیایی پابەند نییە بە دالەوە،کەبوترێ میتۆلۆجیا تەنیا ڕستە ڕیزکردنە لەگەڵ تێگەیشتنی خەیاڵدا بەڵکو میتۆلۆجیا لە زماندا دووبارە کردنەوەی چۆنایەتیی ئاشکراکردنی سیمۆلۆجیایە بەو سیفەتەی کە کۆمەڵێك دال و مەدلوول پێکدەهێنێ و هەر دالێکیش کار بۆ مەدلوولی تازە دەکات (جاك لاكان) لە دووبارە بوونەوەی (من)دا دەڵێت؛ سیمیایی ئاسانکاری نییە بۆ گرێدانی وشە یان هزر بەتەنیا بەڵکو دیاردەیەکی نوێیە لە خودی خۆیدا بەشێوەیەکی پلەدار بۆ نا ئاگای کۆمەڵی دیاریکراو لەم ڕووەوە زیرەکیی دەستکرد هاوکاری هیرمنۆتیکای زمانی کرد بە پێشکەش کرنی بیرو بۆچوونی تازەگەری لەڕووی سیمیۆلۆجیاوە مامەڵەی سیمیایی لەگەڵ زماندا بۆ سێ ڕەهەند دەگەڕێتەوە وەك ڕستەسازی و دەلالی و براگماتی.ڕەهەندی ڕستەسازی (سێنتاکس) ئەمەش لەنێوان خودی نیشانەو نیشانەکانی تر کە لە هەمان گرووپی ڕستە سازی ئەوە، بەلاّم دەلالی واتە پێوەندی نێوان نیشانەو کیانی دروستبوونی بۆ جیهانی ڕاستی دەگەڕێتەوە، بەلاّم براگماتی لە سیمیادا واتەدروستبوونی نیشانەو بەکارهێنانی لەنێوانگۆکردن و بیسەر(مستمع) ئەمانەش دووریی ڕستەسازی و وشەسازییان هەیە، بەلاّم (گادامیر) لەفەلسەفەی وردبوونەوەییدا دایەلۆگ شی دەکاتەوە کە جیاوازی دەکات لە نێوان زمانی ئاسایی و زمانی ئەدەب،بەلاّم پەیوەستبوون لەنێوان ئەم دووانە بەهۆی مرۆڤەوە دەبێت، بۆشیکردنەوەو هەڵسەنگاندن کە کاری میتۆلۆجیای ڕەخنەییە بەوەی کەوا زمانی ئەدەب گوزارشت لە خود دەکات کە ماوەی دووریی دال و مەدلوول دیاری دەکات، بەلاّم ئایا دایەلۆگ،لەزمان پێوەندییەکی زانستی وتن بەشێوەیەکی گشتی سنەری گۆڕاوەکانی ڕەوشت دیاری دەکات کە پێی دەوترێت بەرهەمهێنەری تیۆری لێکدانەوە (تأویل)لە زماندا کە جیاوازی لەنێوان ئاخاوتن و نووسین دیاری دەکات بەپێی سایکۆلۆجستەکانی زمان هەموو ئاخاوتنێك ڕەوشتی وتاری تێدا دەبێت، بەلاّم هەموو نووسینێك مەرجەکانی ئەدەب بە خۆیەوە دەگرێت کەشیکردنەوەی مانایی هەیە.





(چۆمسکی)دەڵێت؛ دەکرێ دایەلۆگ لە زماندا گرەو بباتەوە بە مەرجی تێگەیشتنی پێشینە، ئەمەش بۆچوونی گرووپی دایەلۆگ ناگەیەنێ لە ڕێگای ڕاستی و وشیاریی (پشکنین- فحص).کۆڵەگەی میتافیزیك ئامادەیی بەرچاوی هەبووە لە فەلسەفەی کۆن و نوێی شیکردنەوەی زماندا، لەبۆچوونەکانی (دریدا)دا کە دژ بە نائاگای میتافیزیای ئەگەرەکانی زمان بووە. هەروەها دژ بە (گادمێر) بووە کە بۆ پێشینەی میتافیزیای دایەلۆگی ئەفلاتوونی بەشێوەی پارادیم بۆ زمان بەکاری هێناوە، ئەمەش لێکدانەوەی ئەپستمۆلۆژیا و ئەنتۆلۆژی لاساییە بەرامبەر دروستبوونی وشەکان، (دریدا)ش ڕەخنە ئاراستەی (دی سوسێر) دەکات دەربارەی گراماتۆلۆجیا بەرامبەر دەنگ و دیاردەکانی سیمیایی. کە (سوسێر) فەلسەفەی (ئامادە بوونی) لەشیکردنەوەی زماندا بەکارهێناوە بۆ لێکۆڵینەوەی تاك بەرامبەر تاك، چونکە دەبێ لە کاتی (وتن)دا تەرکیز هەبێ،چونکە وشە ئامادەیی بابەتێکە کە گوزارشتی لێ دەکات یان بیرهاتنەوەی هەڵوێستێکە بۆ خۆسەپاندن لە خودی هەڵوێستەکە، چونکە کاتێ مانای وشەکان پێکدێت درككردنی هەستی بەرامبەر مەدلوول پەیدا دەبێت.ئەو کاتەی دەڵێین (من) واتە ئامادەی خود بەرامبەر جیهانی بەرجەستە بەشێوەیەکی گشتگیر گوزارشت لە دوای من دەکات. سایکۆلۆجستەکان دەڵێن (من) کێشەزایەك دروست دەکات بۆ داهێنان کە ڕەخنەی ناوەوە دەبێتە کەرستەی خاوی پێکهاتەی سایکۆلۆژی،چونکە بۆچوونی دەروونزانی ئەو هاوکێشەیە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێ نووسین پێش وتنە، چونکە جەدەل دروست ناکات لەزماندا بەڵکو قسەکردن منێکی فیزیاوی ون بووە بۆ ئامادەیی هزری دەلالەتەکان. تەنیا نیشانە ماددییەکانی فیزیایی جیهانی دەوروبەر نەبێت کە نیشانەیەکی جوڵانەوەی بەردەوامە،ئەمەش وشە دروست دەکات وتن لەزماندا پەیدا دەبێت، هەموو شێوە وێنەیی و دەنگە هارمۆنییەکان بەر لەزمان و وشە ئامادەیی ماددییان هەبووە ئینجا درككردنی ئێمە وشەکانیان پۆلین کردووە بەپێی هزری بەکارهێنراو.

واتە دروستبوونی مێژووی دەنگ و دیاردە پێوەندیی نووسەرو خوێنەر وەك وتن و بیستن نییە ئەو حاڵەتەی نووسەر دەنووسێ لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا جیاوازە کە خوێندنەوەی تێدا هەرس دەکرێ کە هەردووکیان لەیەکتر ونن و وەڵامی یەکتر نادەنەوە،چونکە ڕێبازی لێکدانەوە قەناعەتی ئەنتۆلۆجییە نەك سایکۆلۆژی. زانستەکان خۆیان لە خۆیاندا جۆرێکن لە لێکدانەوە (گادمێر) لە کتێبی (هونەری بونیادگەری)دەڵێ تێك ئالأن لەگەڵ هونەردا فەرامۆشکردنی جوانکاری نییە بەڵکو کارلێکردنی ڕووداو و تێگەیشتنە کە سنووری لە هاوکێشەی تەکنۆ- زانستی نوێ دەبینێتەوە،حاڵەتی دەرککردنی لێکدانەوەیی هەڵهێنجراوی ئەزموونگەری نا کۆتاییە،چونکە هۆشیاریی پێکهاتەیی لە زمانی بونیادگەری نییە، دەبێ تێگەیشتنی مێژووی بەرامبەر دەرککردنی هەستی سێنتاکسی زمان هەبێت بۆئەوەی شوێنی زانستی زمان لە ئەنترۆپۆلۆژیادا دیاربکرێت‌نووسین بەهۆی دایەلۆگی زمان ڕابردوو داهاتوو بەیەکەوە دەبەستێتەوە هەموو دەقێکی کۆن ڕابردوو نییە هەموو کاتێ مانایەکی نوێ دەبەخشێت و دەلالەتێکی نوێ بۆ دالی نووسراو دروست دەبێت کە هەرکاتێ خوێندراوەی بۆ کرا لە میتازماندا،واتە ئەو زمانەی وتنی پێ دەکرێت گوزارشت لە واقیع و هەڵوێستی ماددی دەوروبەر ناکات، بەڵکو لە جیاتی زمانێکی تر بابەت وەردەگرێت.

دالیش وێنەی دەنگە بۆ وشە یان شێوەیەتی لە نووسیندا، بەڵام مەدلوول تێگەیشتنی پاڵأوتەیە بۆ وشەکان،لە دوای زمان کار بۆ دالی زەمەنێکی تر دەکات و ئەو زمانەش مەدلوولی زمانی پێشووترە؛ واتە چوونەناوییەکی سێنتکسی زمانەکان بۆ فرەلایەنی زانستی ئەو زمانە و زمان سیستەمێکی سەربەخۆیە بەرهەمهێنەری خودی تەواوکراوەو پێوەندی بە دیاردە جیهانییەکان هاوکێشەیەکی ئاڵۆزە تەنیا دەرککردنی عەقڵ دەتوانێت شیکاری بۆ بکات. یەکەی نیشانەکانی زمان و یەکەی مانا لەئەنجامدا یەکەی گۆکردن بارێکی نائارامگیری بە مانا و بابەت دەبەخشێت، چونکە سیمیوتیقی ئەو بارە دەخولقێنێ پێش قسەکردنی منداڵ دروست دەبێت کە





هەوڵی ئەوە دەدات دەنگ دەربڕێت و نیشانەکان دووبارە بکاتەوە؛ بەڵام هێمای باری دەروونییە بۆ هێماکردنی گۆڕاوەکانی دەوروبەر. کە ((فرۆید)) ناوی ناوە سەرەتایەکان یان پرۆسەی گۆڕین.لەوزەی دەروونی شاراوە بۆ هێماکردن تا ڕادەی بەتاڵکردنەوە بۆیە هێما بۆ هەموو شتنەکانی دەوروبەر دەکات گەڵێ جار گرێی ئۆدیب وا لە منداڵ دەکات وشەکان پەنگ بداتەوە لە کردارێکی هەڵگەڕانەوە (نکوص)لە نائاگای خۆیدا لە ژێر سێ دەسەڵاتی چەسپاو بەسەر ئاگای ئەو منداڵە؛ حەز بوون لەگەڵ دایك یان باوك،هەستکردنی بە نامۆیی یان ونبوون لەژێر دەسەڵاتی باوکی کە کیانی ڕەشکراوەتەوە،هەستکردن بە سەربەخۆییبوون لە میکانیزمی نائاگا،بەڵام بوونی تەگەرەو کۆسپ لەبەردەم سەربەخۆیی بوونی ئاگاو بەڕەڵلأبوونی لە جیهانی واقیعی نەك جیهانی دەروونی. لەو کاتەدا هەموو ڕستەیەك ماناکە چیرۆك و گێڕانەوە دەبێت بۆ حاڵەتی سایکۆلۆژی ئەو منداڵەئەمەش گەڕانە بەدوای پەیوەستبوونی بەزەمەنی شاراوەو ونبوو لە یادگەدا کە هەندێ وشە دەردەبڕێ فرمانی نییە یەکەی دەلالی ون بووە تەنیا دەربڕینی دەنگ و داچەپاندنی دەروونی خۆیەتی کە هیچ پێوەندیی بە گەشەی زمانییەوە نییە، ئەمەش بۆ بەتاڵکردنی ناوگیریی داچەپین و هەڵچوونی ژینگەیە. دووبارە کردنەوەی ڕستەکان چێژوەرگرتنە وەك لاسایی کردنەوەی بەرامبەرو گۆرانی و لاسایی کردنەوەی گەورە تەنیا جێبەجێ کردنی حەزو ئارەزووەکانی ئەو منداڵەیە بۆ دەرچوون لە گرێی زمان.

سایکۆلۆجستەکانی زمان دەڵێن جیاوازی‌لە نێوان دەرککردنی یەك مانا هەیە لە ڕووی تێگەیشتنەوە لە ژێر ڕۆشنایی مەدلوولی زارەوەکانی دەروونی و سۆسیۆلۆجی و ڕۆشنبیری و هزری بەهۆی بەرهەڵستەکانی زمانەوانی و پێکهاتەکانییەوە کە مەبەست یان بێ مەبەست بەکارهێنراوە، تێگەیشتن لە نێوان گۆکردن و قسەکردن لێکدانەوەی هەیە بۆ وشەسازیی زمان نەك یاریکردن بە وشەو مەدلوولەکان بۆچوونی دەروونزانی تاك دەڵێت زمان ڕەنگدانەوەی هزرییە بۆ پێداویستییەکان بە

پێی واقیعی کاتی دیاریکراو واتە واقیعی حاڵ بۆ درککردن بۆ هزر یان پێداویستی تاك بۆ درککردن- چارەسەرکردن.لێرەشدا واقیع و پێداویستی فۆرمی گشتین، بەڵام (هزر-چارەسەرکردن) شێوەی تایبەتییان هەیە، کاری تاك بەپێی سایکۆلۆژیەتی عەقڵی ناوەوە تەواو دەبێت و گرنگیی ئایندە دەست پێ دەکات لە چوارچێوەی تێگەیشتنی و وەڵامدانەوە کە تاك بەهۆی ئەندامەکانی هەستیارەوە بۆ ئایتمی کۆمۆڵایەتی دەورووژێت ئەو کاتە هزر و وروژاندنێکی جیاوازە کە هێزی ئاگادارکرەوەیە ئەو کاتە هاوکێشەی ئەرێتی بە وەرگرتنی تەواوی هزر تەواو دەبێت یان هاوکێشەی نەرێتی بەوەرنەگرتنی تەواوی هزر کۆتایی دێت.(گادامێر) دەڵێت: کێشەی زمان لە دایەلۆگی فەلسەفی و زانستی تۆژینگە شوێنی ناوەندی داگیر کردووە کە پێشتر تێگەیشتن لەبیرو هزر ئەو ناوەندەی هەبوو لە سەدەکانی ناوەڕاست کاری فەلسەفە هاوسەنگ بووە لە نێوان فرمانە تازەکانی مرۆڤ لە ڕووی دەرککردنی لەگەڵ پێکهاتەو گشتگیری ژیاندا. ئەم فەلسەفەیەش بە هەموو جۆرە ڕێگایەك هەوڵی ئەپستمۆلۆژی داوە، بەڵام مۆری کاری سەرەکی بوونی مرۆڤە لە جیهانی ماددی و بابەتی لەگەڵ کێشەزانی گشتگیریی پێکهاتەی جیهان، لەچەند هێمای نەگۆڕ دروست بووە کە زانستەکان لەژێر کاری خۆی دادەنێت ئەمیش پەیوەستبوونی مرۆڤە لەگەڵ جیهانی تەکەولۆژی بابەتبدا لێکۆڵینەوە لە زمان دوورکەوتنەوەیە لە نامۆبوونی مێژووی جەدەلی. دووریی لێکدانەوەی زمان پێناسەی مێژوویەکی سەربەخۆیە کۆمەڵێك زانستی جۆراوجۆرە بە خۆوە دەگرێت...چونکە بری ئەو نیشانەی لەبابەتەکەوە دیاردەبێت هەمان نیشانە لە عەقڵی ناوەکی دەدەچێت و لەکاتی خەون و خەیاڵ ئەندێشە کاری خۆیان دەکەن، بابەتە سیمیاییەکان لەو کاتە دەناسرێتەوە.

(ج.گادامێر)بەردیدی تێکست دەخاتە سەر کێشەی سایکرۆنی مانای میتۆدی زمان بە هیچ شێوەیەك مەدلوول دیار ناکات بۆ دالی بابەتی تەنیا لە ڕوونکردنەوەی هێرمینۆتیکای زمان نەبێت کە خۆی مێژووی زمان دیار دەکات، ئەوەی پێناسەی



میتۆدی زمان دیاری دەکات و ناسنامەی دەردەخات تەنیا هێرمینۆتیکا نەبێت بە سیفەتی سایکۆلۆژی تێگەیشتن ئەمەش سێ ڕەهەندی لێکدانەوە لە زمان ڕەت دەکاتەوە بەهۆی وەڵامدانەوەی نیشانەکان دەتوانێت ناوەڕۆکی دەق هەڵسەنگێنین و پۆلینی بکەین. ئەمەش مەدلوول شوێنی نامێنێ، چونکە دوو باری دال دروست دەبێت یا ئەوەتا ئاشکراو بەردید بۆ کاری زانستی و لێکۆڵینەوە یان نهێنی و کۆتایی وەك لێکدانەوەی ( مارکسی،شیکردنەوەی دەروونی بابەتی دەقی مێژوویی، سایکۆپۆلیتیکەر...). لەزمانی دەقدا دال قۆناغی یەکەمی مانایە، بەڵام کۆتایی دال دەلیلی فیکرە نییە لەگەڵ ئەوەشدا دەق سیستەمی دالە بۆ پێش مێژوو، واتە پێوەندیی نێوان دالی زمان و پێوەندییە کۆمۆڵایەتییەکان و دەق ئەو فەزایەیە کە هیچ زمان زاڵ نابێ بەسەر زمانێکی ترسیمیۆلۆجیا بۆ خود واتە دامەزراندنی پێوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان خود کەوا ڕامانێکە بۆ گونجانی نیشانەکانی داهاتوو لە زمانی بیرکردنەوەدا. ئەگەر پرۆژەی هێرمینۆتیکا فۆرمەلەی مانا بێت لە بواری تێڕاماندا کە شوێنی هۆیەکان (زانینی کەسایەتی و شێوەی فەلسەفی) ئاشکرا دەکات. لە تۆژینگەی دەروونی بۆ هێرمینۆتیکا ماوەی ناوەندی گونجانی نیشانەکانە کە هەموو نیشانەکانی زمان پێوەندی نێوان دال و مەدلوول دەگەیەنێ ئەگەر مەدلوول سەرەتا بێت ئەوا دال کۆتاییەکەیەتی و نیشانەکەی شوێنێك لەزەمەنی زمان پەیدا دەکەن و دالیش لای (سوسێر) وشەیە و مەدلوولیش ماناو تێگەیشتنە نیشانەکان پێوەندیی چەشپێنراوە بۆ دیاری کردنی دەستەواژەکان، چونکە زمانەوانی بەشێکە لە سیمیۆلۆجیا، بەڵام (ڕۆلان بارت) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا سیمیۆلۆجیا بەشێکە لە زمانەوانی ئەو کاتە دەتوانین پێوەندی دال- مەدلوول بگۆڕین بۆ بواری ئەزموونگەری ئۆمەنستی بۆ ڕوونکردنەوەی سروشتی خود.

هیچ کاتێکیش لە ڕووی دەروونییەوە بەراوردی نیشانە بەرامبەر زمان نەکراوە، چونکە نیشانەکان کیانی خۆمەکی دەردەخەن، بەڵام زمان کارو ئامرازی قسەکردنە. بۆ پەیوەستبوون بە دەورووبەر کە (جاك لاکان و بیکت) ناویان ناوە زمانی خود دەبێ خود ڕامانکراوی نیشانەکانی هزری تایبەتی بێت کە گونجانی نیشانەکان لەڕێگای چالاکیی بەردەوامی زانیاریی تێڕامان دەبێت و ئەو زانیارییانەی تەواو نابن لە تێڕامان و تێڕامانکراو.خوودی ونبوو بەهۆی نیشانەکانییەوە ئامادە بوو لەڕێگای

هزری نیشانەکان کە چەقبوونی تاك دیاردەکات بۆ فەرامۆشکردنی ماناکان. تێگەیشتنی لەوشەی زمان واتە بوونی تەواوی خود لە هەمان سیمیای وێنەیی و جیاوازی لە نێوان ئەنتۆلۆجیا و عەقلانیەت تەنیا فەزای سیمیۆلۆجییە کە قەوارەی تەواوی تێگەیشتن داگیر دەکات. زمان بە سیفەتی کرداری وێنەی زۆر لە ئایتم (عناصر)ی لێکۆڵینەوەی وشە هەڵدەگرێت.لەگەڵ ئەوەشدا فاکتەری تر هەڵدەگرێت لە ئاستی نواندندا کە دەربڕینە لە کەسایەتیی وشە. لەڕووی سایکۆلۆژییەوە دەقی نۆڤێڵ فراوانترین بواری جۆرەکانی زمان هەڵدەگرێت تەنانەت لە وتاری ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ و ئازاددا،ئەمەش فاکتەری هەڵوەشاندنەوەی زمانە لە ئەدەب. وێنەی زمان ناتوانرێت پەروەردە بکرێت تەنیا لەڕوانگەی زمانێکی ترەوە لەسەر بنچینەی ئەوەی یەکێکیان پێوەرە بۆ ئەوەی تریان. هەڵهێنجراوی میتۆدی فەیلەسووف (باختین) لەسەر ئەوە بوو کەهێڵی دەربڕین چالاکیی هزری ڕێك دەخات، نەك هزر چالاکیی دەربڕین ڕێك بخات و ئاراستەی دیار بکات. لەبەرئەوەی گوزارشتکردن هەڵقولاوی زومونێکی ترە وتن و ئاخاوتن سروشتێکی کۆمەلایەتییان هەیە. ناتوانرێت لە ئایدۆلۆژیای کۆمەلایەتی جیا بکرێتەوە. هەموو زمانێك گوزارشت لە ئایدۆلۆژیایەکی تایبەتی دەکات (لوسیان گۆڵدمان) لە لێکدانەوەی دەقە ئەدەبیەکان لە زماندا دەڵێ:چوونە ناویەك هەیە لە فۆرم و ناوەڕۆکدا بۆ تەواو کردنی ژێرخانی ئایدۆلۆژیەتی کۆمەلایەتی. لای سایکۆلۆجستەکانی زمان ئایدۆلۆژیا پێکهاتەی زمانە کە ژێر بێژی کۆمەلایەتییەو هەموو لاچوونێکی هزری زمانێکی دەستکرد بەخۆوە دەگرێت کە ئەو کاتە وشە بچووکترین یەکەی زمانە بۆ گەڕان بە دوای گەورەترین سنووری مەدلوول زمانی کۆمەلایەتیی ڕستەیەکی کەسایەتیی تاکە لەناو کۆمەڵ بۆ چەسپاندنی خود لەیەك زماندا لەڕێگای گواستنەوەی دەلالییەوە.

(نئوم چۆمسکی) دەڵێ،زمان لە کۆتایی سەدەدا بڕەوی ئەوە لەپێشەوەیە زمان بە تەکنەلۆژی بکەین و عەولەمەی زمان پەیدا بێت، کاتێ باس لە زمانی کۆمپیوتەر دەکرێ کۆمەڵێك دالی دەستەواژەی جیهانی سەرهەڵدەدات کە چەند هێماو نیشانەی نەگۆڕن لە هەموو جێگاو کاتێکدا وەك یەك مەدلوول لێکدەدرێتەوە زمانە ناوخۆیەکان و دایەلۆگی تایبەتیی تەسك دەبێتەوەو شێوەی گشتگیر بەخۆوە دەگرن لە تێگەیشتنی کەسایەتییەوە بۆ پۆلێن کردنی مەعریفەکان زمان باز دەدات، چونکە



هەموو جیهان و لەیەکتر گەیشتنی شارستانیەت و تاکانیەتی سانکۆلۆژی ئەوە دەخوازێ بە خێراییەکی زۆر و ماوەیەکی کەم و بەبێ کەسی سێیەم و عەقڵی وەرگێڕان،خوزیاری کۆمەڵێك سیمیا و هێمای گشتی جیهانی بین لە ڕێگای کۆمەڵێك تۆڕی تێکچڕاوی سەرتاسەری و کاتێ لایەنی دووەم دەبیستن ڕاستەوخۆ مەدلوول لە هزری ئێمەدا لێکدەدرێتەوە (وروژاندن— پرۆسەی کرداری مێشك– مەدلوول).

((هایدگەر)) دەڵێ:عەولەمەی زمان لێك نزیك بوونەوەی شارستانییەتە و ڕەشکردنەوەی سنووری نێوان زمانی پێشکەوتوو و دواکەوتووە لەگەڵ تێکەڵبوونی زمانی گشتی وتایبەتییەکان بۆ دروستکردنی حاڵەتێکی مەعریفی لێك گەیشتن.

قوتابخانەی گشتالتییەکان لە سانکۆلۆژیای زمانەوە دەڵێن چەقکردن لە گشتییەوە بۆ تایبەتی لە هەمووەوە بۆ بەش سیستەمێکی خێرای مێشك پەیڕەو دەکرێ بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی خێرا کە بۆ ڕەوشت و پەرچەکردار گۆڕانکاریی خێرایی لەگەڵدا دەبێت واتە زمانە گشتییەکان مەدلوولی خێراو نەگۆڕیان هەیە وفۆرمێکی میکانیکی لە مێشك دروست دەکەن و چەمکی جیهانبینی کە چەمکێکی قووڵ بووەوە لای گولڈمان کە ناوەندێکە بۆ دۆزینەوەی فاکتەری لێك تێگەیشتنی چینەکان و گولمان چەمکی جیهانبینی لە سایکۆلۆژیك جیا نەکردۆتەوە کە وەك بیرکارێك بەرامبەر کێشە جەدەلییەکانی هزر قوت دەبێتەوە جارێکی تر تێهەڵکشان لەگەڵ دروستبوونی مێژوو دووبارە دەکاتەوە.

لێرەدا مەبەست لەجیهانبینی سیمیایی ئەوەیە کە بەرپەرچی ئەو بۆچوونە سواوانەی پێش سەرهەڵدانی فەلسەفەی زمان دەداتەوە. سەرەتایەکی تازە بۆ یەك زمانی جیهان دادەڕێژێت هەنگاوەکانی تۆژینگەی زمان لە تایبەتییەوە بۆ گشتی...

## سەرچاوە


١-د.نوري جعفر،اللغة و الفكر، مطبعة جامعة بغداد،(١٩٧٤).

٢- زانستی زمان و سیمۆتیك، سەنتەری تۆژینگەوەكانی زانستی زمان و سیمیۆتیك، فرنسا، (١٩٧٦).

٣- تريفرز، علم النفس التربوي، ترجمة، د.موفق حمداني و د.حمد الكربولي، مطبعة جامعة بغداد، (١٩٧٩).

٤- مسعود محمد، رستەسازی، رِۆشنبیری نویَ، ذ (١٢٣)، (١٩٨٤).

٥- محمد عبدالحميد إبراهيم، لويس طولدمان و البينوية التوليدية- مساهمة في علم الاجتماع الادبي مجلة المنار- العدد (٥٨)، (١٩٨٩).

٦- لويس طولدمان، النقد التكويني، د. محمد تقي، (١٩٨٩).

٧- د. علي زوين، ضلال المعنى، مجلة آفاق عربية، العدد (٥)، بغداد، (١٩٩٠).

٨- د. شێركۆ بابان، میكانیزمە بنەڕەتیەكانی ڕستەسازی ڕێزمانی (بوون و هەبوون) هەولێر، (١٩٩٧).





٩- نعوم ضومسكي، اللغة والعقل، ترجمة. رمضان مهلهل سدخان، مجلة الثقافة الاجنبية، العدد الاول، بغداد، (١٩٩٨).

١٠- جوليا كرستيفيا،في اللغة و التحليل النفسي، ترجمة،علي عبدالصمد، مجلة الاقلام، العدد (١)، بغداد، (١٩٩٨).

١١- واثق الدايني، مطبعات في الفكر و الممارسة، مجلة الموقف الثقافي، العدد (١٤)، بغداد، (١٩٩٨).

١٢- أيان مامكين، القراءة و التأويل، ترجمة، خالدة حامد، مجلة الثقافة الاجنبية، العدد (١)، بغداد،(١٩٩٩).

١٣- باسم صالح حميد، الحوارية و فلسفة اللغة، مجلة الطليعة الادبية، العدد (٢)، بغداد، (١٩٩٩).

١٤- د.ماجد النجار، علم اللغة و الترجمة الآلية،دراسات الترجمة، العدد (١)، بغداد، (١٩٩٩).




# لێكدانەوەی سایكۆلۆژی بۆ ئیستاتیكا

بومارتن دەڵێ (هەموو شتێكی جوان نابێتە ئارامگیری دەروون)، دەقە جوانەكان بە پێوەری هەستە باڵایەكاندا سنووریك لەنێوان پرۆسەكانی پەرچەكرداری هزر دادەنێت. كەوو كرداری كۆنتراستی مێشك روودەدات بۆ لێك جیاكردنەوەو هەڵسەنگاندنی كاری دەقە هونەرییەكان، ئیستاتیكای دەق لێك ترازانی هزری ئەبستمۆلۆژیا لەگەڵ هزری وەهم رادەگەیەنێت. بەپێی ئاستی تێفكرینی (بنامین بلوم) كە كاری باڵا بۆ كردارە هزرییە مەعریفییەكان لە بەرزترین پلەی كاركردنیدا سنووری ئیستاتیكا دیار دەكات بەهۆی چێژ وەرگرتنەوە لە كارە هونەرییەكانی دەستكردو سروشتی. ئیستاتیكا وەك چەمكێكی فەلسەفی هەوڵی پتەوكردنی پێوەندی لەنێوان مرۆڤ و سروشت دەدات، واتە گەڕانەوەی دیالێكتیكانەی بۆ كردارە (خودی و بابەتیەكان) ی مرۆڤ، ئیستاتیكا فەلسەفەی جوانی دەگەیەنێت،ئەوا مێژووی ئیستاتیكا بریتییە مێژووی فەلسەفە لەو لایەنانیدا كە پێوەندی بە لێكۆڵینەوەی هونەرو جوانییەوە هەیە. گەڕانەوە بۆ دەسپێكی فەیلەسووفەكان دەربارەی فەلسەفەی جوانی.

کۆمەڵەی ئەفلاتۆن (ئەرستۆ- ئەفلاتۆن- سوکرات) ئەمانە دامەزرێنەری بنچینەی زانستی ئیستاتیکان کە سوکرات دەڵێ: جوانی رەوشتێکی تایبەتی نییە کە داتاشراوی بابەتێك بێت، مرۆڤ جوانە سروشت جوانە، بەلاّم لە سەرووی هەموویانەوە جوانی خۆی هەیە، جوانی بابەت و فۆرمە بۆ خۆی لە دوو تویّی زانستێکدا. لێرەدا سوکرات باسی ئەوە دەکات چۆن لە رێگای خۆشەویستییەوە دەگەینە جوانی.

ئەفلاتۆن پێمان رادەگەیەنێ: خۆشەویستی گەڕانە بەدوای جوانی رەهاو نەمری و رووحی خواوەندو گەڕانە بەدوای ڕاستی سروشت و حەزبوونە لە نەمری پاك. ئەمیش جیهانی بەرجەستەی هەستپێکراوە.. بەهۆی خودی جوانی خۆی مرۆڤ دەتوانێت بگاتە خواوەندی ریهایی، جۆانی جوان دەبێت بە جوانییەکەی خۆی و لای ئەفلاتۆن گەڵێ جار ناتوانرێت بگەینە جوانی سروشت چونکە فەلسەفەی جوانی تێکەڵ بە هێزی جوانی خواوەند دەبێت. ناوەڕۆکی هونەر لای خودی ئەفلاتۆن ئەوە دەگەیەنێ کەوا جوانی لە ئاستی ژیانی مرۆڤ نییە، لەسەر زەوی جوانی بەدیارناکەوێت تەنیا لەدەرەوەی سنووری جیهانی ماددی و هەستپێکراو دیار دەبێت. ئەرستۆ بڕوای وابوو جوانی دروست نابێت تەنیا بەرێك خستنەوەو کۆکردنەوەی بەشەکانی سروشت لە یاسایەکی دیاریکراودا چونکە جوانی یاسا و رێکخستنەوەی سروشتە. هونەر لای ئەرستۆ لەسەرویان لەژێر ئاستی سروشت بووە، کاری هونەر تەنیا گۆڕینی سروشتە بە هەموو مەعریفەکانییەوە بۆ گەڕان بە دوای کامڵ بوون واتە خەڵك لەوە جوانترە کە لە واقیع دا هەیە، هونەر دۆزینەوەی ئەبستمۆلۆژیایە بە هاوکاریکردنی هزری خەڵك لەنێوان خۆیان کە بەرهەمی داهێنانی شێوەنوێیەکانە لە سروشت، بەلاّم کانت (١٧٤٢-١٨٠٤) دەربارەی هونەری جوانی دەڵێت؛ بریتییە لە گونجان لەنێوان تێگەیشتن و خەیاڵ ئەوشتانەی کە بڕیار دەدەین لێیان تێدەگەین تەنیا لە خەیاڵی ئێمەدا دروست دەبێت لە راستیدا نییە، تەنیا بۆ حەوانەوەی خودی مرۆڤە واتە ئەو بابەتەی لای کانت هەیە، بریتییە لە



پێشبڕکێ (منافسە) لە نێوان شێوازەکان و دەوەستێتە سەر کاریگەری بیرو هەستی مرۆڤ تا چ رادەیەك دەیان وروژێنێت.

((کانت)) باس لە جوانییەکی تر دەکات وەك جوانی گوڵ، منداڵ، خوا. کە بەهەمان شێوە جوانییەکی تر هەیە پێی دەوترێ جوانی سەربەست، بۆیە پێی دەوترێت سەربەست چونکە حوکم دانە لەسەر خودی خۆی، بەلاّم هونەرمەند لە بواری ئیستاتیکا بریتییەلە دروستکردنی هۆشی هونەرە جوانەکان لای ئەو کەسانە دروست دەبێت کە رامان بەرامبەر سروشت دەکەن بەبێ بیرکردنەوەیەکی پاشینە، ((کانت)) ئەم کردارەی لە چوارچێوەیەك کۆکردۆتەوە ناوی ناوە دادگای سێیەم یان دادگای عەقڵ کە دوو جۆری شیکردنەوەو جەدەلن (تحليل وجدل) ئەمەش رەخنەگرتنە لە لاهوت کە کۆتای بە سروشت دێ و بریتییە لە شیکردنەوەی جوانی بۆ شیکردنەوەی داهێنان بەچوار قۆناغی مەعریفی (جۆر، ژمارە، رێژە، نموونە) هەر هەموویان دەچنە بازنەی چێژ وەرگرتن بۆ یەك میکانیکی هزر ئەویش وەرگرتن و وەرنەگرتنە و لەیەکەم هەست کردن بە جوانی دەبێت، ((کانت)) گەیشتە ئەو بڕوایەی کە جوانی هونەر بەپێی تێگەیشتن و بیرکردنەوە لە بابەتەکە لە هەموو شتێکی جوان و سەرنج راکێش دەست پێ دەکات. کەرادەی جوانیەکە دەوەستێتە سەر کەم و زۆری سەرنج راکێشان، لە کۆتایدا ((کانت)) بایەخ بە شێوە دەدات نەك بە ناوەڕۆك هەموو شتێ لە رواڵەتدا دەست پێ دەکات ئینجا ناوەڕۆك بە دوای دێت واتە رواڵەت ناوەڕۆك دروست دەکات بەتێگەیشتن لە فۆرمالیزم.

فەیلەسووف شیللەر (١٧٥٩-١٨٠٥) کورتەیبیروباوەڕی شیللەر لەئیستاتیکادا دەوەستێتە سەر هونەرمەند کە چالاکی هزریە لە زاتی هونەر بۆ گونجانی (سروشت و هزرو ماددەو شێوە) واتە کاری هەنەرمەند کۆکردنەوەی ئەو چوار بابەتەیە. کە هونەرمەند سەر دەکەوێ بەسەر سروشت، سروشت دەکاتە هێزێکی دەرەکی ئەمیش نهێنی هونەرمەندە کە سروشت رەش دەکاتەوە، یا لەناوی دەبات بە هۆی شێوە

(فۆرم)ئەو كاتە هونەرمەند دەبێتە ئەفسووسێكی چاك وەك ئەوەی لەدەست دروستكەر (خالق) چووبێتە دەرەوە، هونەرمەند لای ((شیللەر)) زۆر پیرۆزە.

لەكۆتایدا ((شیللەر))دەڵێت مرۆڤ بەشێكە لە سروشت هیچ سروشتێكی تر نییە دوای ئەو،هەروەها لە جوانی سروشت بەدەرنییە بۆ دەركەوتنی راستی خۆی لە چوارچێوەی فەلسەفەی جوانیدا. هیگڵ (١٧٧٠-١٨٣١) فەیلەسووفێكی ئەڵمانیە بە باشترین و چاكترین نووسەری ئیستاتیكا دەژمێردرێت. بۆچوونی ((هیگڵ)) لەسەر ئیستاتیكا دەڵێ،جوانی ئەو شێوە هەستیارە هونەرییەیە كەبنچینەی بیركردنەوەیە لە ناوەڕۆكدا،بەڵام شێوەی جوانی وێنەگرتنی هەستی وێنەگرە بۆ بیركردنەوە. بۆ ئەوەی بگەینە بابەتێكی هونەری دەبێ ٤٨ ناوەڕۆك لێك بدەینەوە بە شێوەیەكی زانستی. ((هیگڵ)) چالاكی هونەری گەڕاندەوە بۆ نەمریی بە هۆی بەهای ناوەڕۆك و دووركەوتنەوە لە فۆرم و لە بابەتی ئیستاتیكا. یەكگرتنی هونەر بە هۆی شێوەو ناوەڕۆك دەبێتە بناغەی هەموو جوانییەك و لەوەوە دەست پێ دەكات كە بریتییە لە چالاكی هۆش كە خودی خۆی دەدۆزێتەوە. هونەری جوانی ئەو كاتە دەگاتە ئامانجی بالای خۆی كە لەگەڵ دین و ژیان یەك دەگرن بۆ هۆشی خواوەند، ئەمیش دەربڕینە لە قووڵایی ناخی بەرژەوەندی راستی بیری مرۆڤ ئەستەمە بگاتە پلەی تەواوبوون بەبێ زانست.ئەو جوانییەی لە واقیعدا هەیە تەنیا لە خەیاڵی ئێمە هەستی پێ دەكەین بۆ شكاندنی جیهانی هەستپێكراو بە بۆچوونی (هیگڵ) هیچ شتێك لە واقیعدا نییە ناوی جوان و ناشیرین بێت، یان باش و خەراپ تەنیا پێوەری خەیاڵی ئێمە دەریان دەبڕێ و هەڵكشاندنی دەقی ئەدەبی دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی خەیالات نەك ئاستی زانستی دەقەكە. هیگڵ حوكمی مردن لەسەر هونەر دەدات باسی نەمری ناكات واتە هونەر لە بالاترین قۆناغی پێگەیشتن دەبێتە رابردووی فكرەی مرۆڤ و ئەندێشەیەكی زەمەنی خەیاڵی میتافیزیكی. ((شوبنهاور)) (١٧٨٨-١٨٦٠) كە یەكێكە لە لایەنگرانی ((كانت)) و فەیلەسووفێكی (نەمساوی) یە دەربارەی ئیستاتیكا دەڵێ،ئامانجی هونەر ئامادەكردنی بەشێكی دیاریكراوی هۆش و بیری



مرۆڤە لە پێناو جیهانێكی راستی، جوانی بەدەر نییە لە هێزی مرۆڤ. شوبنهاور دەڵێ: بالاترین شێوەی هونەر جوانی شیعرە، چونكە هەڵگری بابەتێكە ئەویش فكرەیەو هونەر دەربڕینێكە لە ئیرادەی مرۆڤ، بەڵام فەلسەفە بەرامبەر هونەر وەك شەراب بەرامبەر ترێ وایە. هونەر هۆیەكە بۆ گەیشتن بە جیهانی پاك و دەرەوە، یان پێگەیشتن و پێشكەوتن بۆ هەموو شتێكی مەوجوود بەم جۆرە دڵسۆزی لای ((شوبنهاور))بەرامبەر بە ئیستاتیكا دەبێتە رەش كردنەوەی كێشەی ژیان و ئەم دەربڕینە لای فكرەی ((نیتشە))تەنیا نەمری هونەرمەند یەك ناگرنەوە كە ((نیتشە))نەمری هونەرمەند دەبەستێتەوە بە ئاكارو رەوشتی خودی هونەرمەند و كارەكەی رەنگدانەوەی ئاكاری خۆیەتی. (لیبینتز) فەیلەسووفێكی فەرەنسییە لە سەدەی (١٨) ژیاوە لە رووی ئیستاتیكاوە بایەخ بە تێگەیشتنی (ژیان، شێوە، ئامانج) دەدات،بەڵام جیهان تەنیا وێنەی ئاشكرایە لە تێگەیشتنی ئێمەو رەنگدانەوەی ململانێی ناخی خودی مرۆڤە بۆ هونەرو جوانی.بۆ چوونی (ماركس) لەسەر ئیستاتیكا، ماركسییەت ئاوڕدانەوەیەكی گرنگی فەلسەفی بوو بەرامبەر جوانناسی ئیستاتیكای ماركس ئەو زانستەیە كەوا یاسا و پێوەندییە جوانناسییەكان دەخاتە ناو چوارچێوەیەك بۆ بەیەك بەستنەوەی مرۆڤ بە جیهانی دەورووبەرو دیراسەكردنی هەموو شێوەكانی پێوەندی ئاڵوگۆڕ كراو لە نێوان توێژەكانی كۆمەڵ، ماركس لە كەپیتاڵ و رەخنەگرتن لە هەموو ئایدیۆلۆژییەكانی سەردەمی خۆی و رابردوو جەخت لەسەر ئیستاتیكا دەكات لە كارە هونەرییەكان كە یەكێكە لە رەهەندەكان و پێوەندییە بە ئابوورییەكانی تاك و كۆمەڵ، هەموو دەقە ئەدەبییەكان و هونەرییەكان بە دەقە فەلسەفییەكانیش، لای ماركس دوو جیهانبینی واقیعی هەیە كە لە خەیاڵ جێگایان نابێتەوە ئەمەیش جیهانبینی چینی كرێكارە كە گوزارشت لە ئیستاتیكای واقیعی پێوەندییەكانی جیهانی راستی دەكاتەوەو هەڵقووڵاوی هەموو دەقێكی زانستی – سایكۆفیزیاوییە، بەڵام دووەم جهانبینی سەرمایەدارییە كە تێكدەر و ئیفلیج كردنی هەموو راژە

کۆمەڵایەتییەکان و پێوەندییەکانی تاکیی کۆمەڵە ئەمەش ئەنتی ئیستاتیکایە بۆ زێدەبایی بەرژەوەندی خۆی کار دەکات، وەك هاوکێشەیەکی نا هاوسەنگ لە جیهان بۆ زێدی چێژە چڵێسەکانی خۆیان و زیاتر کردنیی تاریکستانی جیهانی کریکار، بەڵام ((ئەنگلز))لە هەندێك بۆچوونی مێژووی ئیستاتیکا بەراوردێك دەکات لە نێوان فەیلەسووفە واقیعی و وەهمییەکانی گریکی (یۆنان)ی کۆن. کە دەقە هونەرییەکان رەنگدانەوەی حاڵەتێکی گۆڕاوی بەردەوامی ماددی مرۆڤە، کە مرۆڤەکان بۆ ئارامگیری و کامڵ بوونی هۆشیاری و دۆزینەوەی خۆیان لە ناو توێژێك،جۆرێك لە پێناسەکردن دەردەبڕێت تا بناسرێتەوە لە رەوتی مێژوودا ئەمیش داهێنانە لە دەقە هونەرییەکان بۆ ئینتیماکردن لە چینێك وەك دەڵێن فلان دەق و کاری هونەری گوزارشت لە فلان توێژی کۆمەڵ دەکات، بەڵام ((ماو تسی تۆنگ))وەك مارکسیزمێك زیاتر بایەخی بە میتۆدی شۆڕشی رۆشنبیری داوە لە کاری رەخنەگرتن لە دەقە ئەدەبی و هونەرییەکان کەنارگیر بووە دەڵێت: هەموو (رۆشنبیرییەك)ی دیاریکراو رەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژییەتی سیاسی و ئابووری کۆمەڵێکی دیاریکراوە ئەو دەقانە گوزارشت لە خواست و ئارەزووی ئەو کۆمەڵە دەکات و لە خزمەتی دایە. چینی بۆرژوازی پێشکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێنا لە هەموو بوارەکانی زانست و ئەدەب و سۆسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا و زانستی سەربازیی و مێژوو هونەر (شانۆ، سینەما، مۆسیقا، شێوەکاری)...

کەوەك چەکێك بەکاری دەهێنا بەدرێژایی مێژوو بۆ خۆپاراستن و بەرگری کردن لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی، ئیستاتیکای دەق تووشی داخوران ببوو هاوکێشەی هونەری ناهاوسەنگ بوو. بە بۆچوونی ((ماو)) ئیستاتیکای ئەدەبی هاوچەرخ دەبێ بگونجێت لەگەڵ رەوتەکانی جیهان و وەڵامی داخوازییەکانی کۆمەڵانی خەڵك بداتەوە گوزارشت لە بۆچوونەکانی تەواوی کۆمەڵ بکات ئەگەر ئەو دەقە هونەرییانە وەڵامی پێداویستی کۆمەڵی نەدایەوە، ئەوا وەك سەرکردەیەکی بێ سوپا وایە.((ف. لینین)) دەڵێ:ئێمە دەزانین ناتوانین ژێرخانی سۆسیالیستی بنیات بنێین





بەبێ رۆشنبیری بۆرژوازی و هەزم کردنی جوانکاریی تەکنیکی و ئەدەبی وهونەری، واتە دەبێ ئیستاتیکا لەژێر رکێفی سەرمایەداری دەربهێنرێت و بدرێتەوە دەستی چینی کرێکار.گرنگترین پێوەندیش گۆڕینەوەی هونەرە کە ناتوانرێت جیابکرێەوە لە چالاکی مرۆڤی کۆمەڵایەتی، وەك چالاکییەکانی تری مرۆڤ (رامیاری، فەلسەفە، ئاکار، دەروونزانی، پەروەردە) کە هەموویان بە بۆچوونی ((لینین)) بابەتی زانستی و جوانی تایبەتن بە چالاکی ئیستاتیکای مرۆڤ ئەمەش لە ئەنجامی پێشکەوتنی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بووە. لەو فەلسەفەیە وا باو بوو کە جوانناسی تەنیا کۆکردنەوەی بۆچوون و بیردۆزی فەلسەفی بێت، بەڵکو ئیستاتیکا بۆ ئەوە پێشکەوت کە قبووڵی رەخنەوو هەڵاوسانی داهێنان و پێشکەوتنی هونەر بکات. زانستی جوانی مێژووییەکی تایبەتی هەیە کە پرۆسەی لێك تێگەیشتنی زانستی و شارستانییەتە لە نێوان بۆچوونەکانی کۆمەڵ بە هەموو جۆرە ململانێیەکی ماددی و میسالی... بەڵام چێژ وەرگرتن لە کاری هونەری دەچێتە خانەی چێژی چینایەتی واتە کاری ئیستاتیکا بۆ چینێك بەڕێوە دەچێ. ((لینین)) دەڵێ: زانستی ئیستاتیکا پێوەندییەکی توندی بە مێژووی رۆشنبیری و نەتەوایەتی و هۆشیاری کۆمەڵایەتییەوە هەیە و پێوەندی بە دەروونزانی هەیە، چونکە دیراسەی یاسایەکانی رەوشتی گۆڕاوی مرۆڤ دەکات، بۆچوونەکانی ئیستاتیکا لەسەر ئایدیۆلۆژیایەك بەند نابێت،بەڵکو زیاتر دەربڕینە لە خودی رەوشتی چینەکان، هونەرمەند لە قەڵایی هۆشیاریدا بە دوای راستی بابەتی کۆمەڵایەتی دەگەڕێ کە ئەمەش لەبەرهەمی هونەرەکەیدایە. ئیستاتیکا دەربڕینە لە ململانێی چینەکان بۆ هۆشیاری کۆمەڵایەتی و پەیدابوونی شۆڕشی کۆمەڵایەتی. هەروەك ((جورج بلیخانۆف)) دەڵێ:ئەوەندە بەس نییە بڵێین هونەر و دەقی ئەدەبی فۆرمی وێنەیە بۆ ژیان.هونەر دەبێ دەسپێکی دەربڕینی ژیان بێت لە دینامیکی گۆڕاوەکانی کۆمەڵایەتی تێبگات هونەر دەبێ بگاتە قۆناغی رەخنەگرتن لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

((هربرت رید)) دەڵێ: (هەقمانە ئەگەر بڵێین کۆنترین شێوەکانی زانین نزیکن لەوەوە کە ئێمە بە شێوەکانی ئیستاتیکی ناویان دەبەین، چونکە رەگەزەکانی هەستیی ئەبستراکت تێیاندا بەسەر شێوەی زانینی لۆژیکی و شیکردنەوەدا زاڵە).

((کارل یۆنگ))لە سایکۆلۆژیای ئیستاتیکا باس لەوە دەکات کە هاوکێشەی کەسێتی لە هونەردا شتێکی جەوهەری نییە بەلای سایکۆلۆژیستەکان تا ئەم هاوکێشەیە زیاتر بێت گرنگیدان بە هونەرەکە کەمتر دەبێتەوە، چونکە کاری هونەری رەنگدانەوەی کەسێتی خاوەنەکەی نییە، بەڵکو گرنگییەکەی لەوەدایە کە خۆی بۆ سەرووی ژیانیی کەسیی بەرز دەکاتەوە..

کاتێ هونەر بە تەواوەتی کەسی (شخصی) دەبێت ئەوە شایانی ئەوەیە کە وەك نەخۆشی عەسەبی لێی بکۆڵدرێتەوە، قوتابخانەی ((فرۆید)) هەموو هونەرمەندان بە (نرجسی) دادەنێت، واتە پێگەیشتنی سایکۆ- بایۆلۆجی تەواو نەبووە، هەندێ خاسییەتی منداڵی و خۆ خۆشەویستیان لاماوە، بەلاّم ئەمە مرۆڤی هونەرمەند ناگرێتەوە، بەڵکو هونەرمەند وەك کەس (شخص) لە چێژ لە خۆی، یان لە کەسی تر وەرناگرێت، بەڵکو ئەو بوویەکی بابەتی و ناکەسییە. ((یۆنگ)) لە بۆچوونێکدا دان بەوە دەنێت کە لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆژی ناتوانێت جەوهەری هونەر دەستنیشان بکات..تەنیا لە رێگەی میتۆدێکی هونەری و ئیستاتیکییەوە دەتوانێت حەقیقەتی هونەری تێبگەین..ئەو میتۆدەش کە ئەو باوەڕی پێیە میتۆدی زەین رووناکییە کە بۆ مرۆڤ دەگونجێ و بەچرکەیەك بگاتە قووڵاّییەکانی راستی هونەر. ((یۆنگ)) لە تیۆرەکەیدا بە تواوەتی هونەرمەند لە واقیعی کۆمەلاّیەتییەکەی دادەبڕێت بەلای ئەوەوە تەنیا داهێنان هونەرمەند دروست دەکات، ئەوەش کاتێ کەوا بۆشایی دەکەوێتە ژیانی کۆمەلاّیەتییەوە لەگەڵ رەمزی واقیع دا. لێرەدا دەتوانین ئەو پەندە گەورە تێبگەین کە لە بیری (ستانسلافسکی)دا حەشار دراوە کاتێ دەڵێت: دەبێ هونەرمەند هونەری لە خۆیدا خۆش بووێت، نەك خۆی لەناو هونەر بەند بکات، لە حاڵەتی دووەمدا،هونەرمەند لە شتی شازو بێ بایەخ بەولاوە ناتوانێت هیچ





بەدەست بێنێت، بەلاّمکاتێ هونەری لەخۆیدا خۆشدەوێت، ئەوا دەتوانێت دەسبەرداری حەزە بچووکەکانی بێت و بایەخ بە دەقی بابەتی بدات. سایکۆ- ئارت ئەوە دەخاتەڕوو کە گرنگی کاری هونەری ئەوەیە گوزارشت لە چەشنێکی هونەر، تەکنیك یا هەست و خرۆشێکی لایەك نەکات، بەڵکو ئەرکی ئەوەیە گوزارشت لەو ئیلهامە بکات کە شیاوی دابەش کردن نییەو لە کەسێتییەکی تەواو دەردەچێت. گەلێ جار ئیستاتیکا گوزارشت لە نەبوونی و بێهودەیی و هیچێتی ژیان دەکات، هەروەك کۆمەڵێکی ئەدیب و بیریار (سارتەر، کامۆ، دالی، تریسان، بێکێت...) تەوەرێکی بێ باوەڕییان لە شاکارە هونەرەکەیان دروست کرد، شڵەژان و نامۆی تا پلەی نەخۆشی دەروونی کە ژیان و واقیع بەسەر تاکی سەپاندووە دەبێ چاوەڕێی رووداوی کارەساتی مەرگ بکات،مرۆڤ هەموودەم نامۆیە لە ژیانداو پێوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان ئەوا جوانی لە مردن دەدۆزێتەوە، بەلاّم راستی سایکۆ- ئیستاتیکا ئەوە دەردەخات کە کاری هونەر دروستکردنی ژیانە بۆ جیهانێکی سەربەخۆو توانستی بەدەستهێنانی نەمری هەیە، ئەم کارە لە ڕووی فۆرمەوە بابەتێکی جەدەلی زیندووە لە رێگەی هەستەوە دەرکی پێ دەکەین و ئاشنای دەبین بە هزری مەعریفی ئیستاتیکا کاری هونەری جوانکاری نییە،بەڵکو گەڕانە بە دوای مەنزڵگای رووح و حەوانەوەی هزری تاکە کەس لە چوارچێوەی هزریی بیرکردنەوەدا.

بایۆ- ئیستاتیکا لە رێگای هەستەوەرە بالاّکان کاری فەسلەجە ئەنجام دەدات ئەو دەقە نایاب و ئاوازی بە جۆش و دیمەنی جوان لە هەڵسەنگاندنێکی هەستی رەوشتی تاك دەگۆڕن و لە خانەکانی بیرەوەری (زاکیرە)ی مێشك چاپ دەکرێن و لە کاتی پێویست بەهۆی هەڵوێستی جیاجیای جوانکاری بەکاردەبرێت لە رێگای پێنج هەستەوەری راستەوخۆ بەرامبەر سروشت کە هەر هەستەوەرێك کۆگایەکی بیرەوەری هەیە بەهۆی پرۆسەیەکی میتاپۆیزمی هزر روو دەدات وەك بینین دیمەنێکی جوان لە رێگای چاوەوە ئەوا بەهۆی (٨٠٠) تۆڕی تێك ئالاّوی گەیەنراو بە مێشك لەیەك زەمەنی رەهادا (٣) کرداری گەورە بۆ هەر گرتەیەکی چاو دەکرێ وەك دووری فیگەر

ماوەی نێوان ئەو تەنەو سۆمای چاو لەگەڵ قەبارەی ئەو تەنەو قەبارەی چەند فیگەرێك کە دەکەوێتە ناو بواری ئاستی بینین یان ئەو پانتاییەی کە دەکەوێتە بەر تیشکی دیدگای بینین لەگەڵ کرداری سێیەم، رەنگەکان و رەنگی تەنەکان و لێك جیاکردنەوەو دیاری کردنیان بەهۆی سێ سیستەمی رەنگی چاو دەبینین، بە هەمان شێوە لەرەلەری ئەو رەنگانە بەهۆی گوێ دەچێتە کۆگای بیرەوەرییەکان و لەکاتی پێویست دووبارە دەگەڕێتەوە سروشت لە کاتی هاوبەند بوونی هەمان هەڵوێستی فێربوونی هەستی لەگەڵ هەستی بیرەوەری بۆن و تام و دەست لێ دان لە گرتەی ئیستاتیکا بەکاردەبرێت.

جوانۆلۆجی ئەو زانستەیە کە لە دوای چێژ دەگەڕێت کەلە دەوروبەرماندا هەن و کارلێك دەکەن هەر بابەتێك و فۆرم و ئاوازو دەقێك ئەگەر چێژ دروست نەکات لە رێگای هەستەوەرە بالآکاندا ئەوا دژە ئیستاتیکایە، چونکە جوانۆلۆجی ئاستێك لە نێوان بابەتە ماددی و هزرییەکان دادەنێت و کاری ئیستاتیکا لێك جیاکردنەوەو دابڕانی کاری جوان و ناشیرین پۆلێنی دەکات، بەلآم کاتێ باسی زانستی شەڕ دەکەین تەنیا بیرخستنەوەی سەرکەوتن و دۆڕاندن نییە لە شەڕ بەڵکو جووڵانەوەی سەربازو ماشێنەکان و مارش و چیاو دەریاو بیابان و کەوتن و کوشتن و ورەدابەزین، چۆن دەتوانین لەم رووەوە فەرمانەکانی ئیستاتیکا دیار بکەین ئایا راستگۆن یان درۆ، رەهان یان رێژەیی، خودی یا بابەتیی چۆن دەتوانین ئیستاتیکا لە ژێر ئەم فاکتەرانە هەڵسەنگێنین، زۆر لە کارە فەسلەجییەکانی هزری ناوەوە کارەکانی ئیستاتیکا پۆلێن دەکەن بەسەر غەریزە فەسلەجییەکانی مرۆڤ، وەك غەریزەی گەیاندن، حەزکردن لە قسەو گوێ گرتن.غەریزەی دراما، حەزکردن لە نواندن و نووسینی دەقی دراماییی، ئەمەش لە ژێر کاریگەری غەریزەی سۆزو ویژدان دەبێت غەریزەی هونەری شێوە، حەزکردن لە رەسم و وێنەکردنی هزر غەریزەی مۆسیقا حەزکردن لە سەما و گۆرانی و ئاواز، ئەمەش لەژێر کاریگەری غەریزەیجوانی دەبێت. غەریزەی ئاشکراکردنحەزکردن لە زانینی هۆکارەکان. غەریزەی دروست، حەزکردن لە





دروستکردنی شتەکان کە ئەمەش لە ژێر کاریگەری غەریزەی زانین دەبێت، مەرج نییە غەریزەی هونەری گوزارشت لە ئیستاتیکا بکات، بەڵکو غەریزەی گەیاندن و دراما لە رێگەی شیعر نووسینەوە دەتوانێت ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێت.

(هۆلمز)وای لێك داوەتەوە کە غەریزەی ئاشکراکردن واتە حەزکردن لە زانین بە تەنیا بۆ تەواوکردنی رەهەندی ئیستاتیکایە کە بە پێی پەروەردەی هونەری. لەگەڵ هەموو غەریزەکانی تر جیاوازە هەستی جوانکاری دووریەکی میکانیکی کەسایەتییە، کە هونەرەکە دروست دەکات جگە لە چێژ وەرگرتن، هەستی ئیستاتیکا سیفەتێکی جیاکراوەیە لە هەستە بالآیەکانی مرۆڤ ماوەی نێوان کارە هونەرییەکانی ئیستاتیکاو لێك دانەوەی لە روانگەی بینین و بیستن دا لە زەمەنی چێژ وەرگرتن هەستی ئیستاتیکا دروست دەبێت. واتە ماوەی نێوان تراژیدیای کۆمەڵ و گۆڕانی بۆ تاکە کەس و لێك دانەوەی لە هەستەوەرە شاراوەکان (ویژدان و واقیع) بۆ لە دایك بوونی کۆپلەیەك هۆنراوە لەو زەمەن بەر لە کۆتایی هاتنی دەقەکە ئاگای ئیستاتیکا دروست دەبێت. کە چەند وشەیەکی پالآوتەی پێ ریز بەند دەکرێت و دەقی هۆنراوەکە کۆتایی دێت، گەلێ جار لە میتاماناوە پەرەگرافی دەقەکان دەبنە سێبەری هەستە ئیستاتیکیەکە. (هیربرت رید) هەموو فۆرمەکانی شێوەکاریبەسەر چوار قۆناغی هەستی ئیستاتیکا دابەش دەکات بە پێی واقیعی مێژوو قۆناغی هەزم کردنی دەوروبەر بۆ فۆرمی ئەو شێوەکارییە:

واقیعی و ئینتباعی و کاریگەریەت: ئەمانەش هەموو زاراوەن بۆ لاسایی کردنەوەی جیهانی سروشتی دەرەوە.

(٢) وەحشیەت و گوزارشت کردن (تعبیریە) : دەلالەتی گوزارشت کردنە لە هەستە ناسکەکانی کەسایەتی هونەرمەند واتە گوزارشت کردن لە خودی خۆی.

(٣) شەش پالۆیی و وەزیفی و بونیادی، کە زاراوەیەکن باس لە خەریك بوونی هونەرمەند بە سیفەتی (زگماکی) و شێوەکان دەکات یان رووتەڵەکردن (تجرید).

(٤) سەروو واقیعی (سریالی) و (مستقبلی) داهاتوو، گوزارشت لەوەدەکەن بەرامبەر پەرچەکرداری جیهانی دەرەوە بەرەو هەڵوێستێکی نا ئاسایی رووحی.

واتە واقیعی بەرامبەر بیریاری، سریالی بەرامبەر ویژدان، گوزارشتی (تعبیری) بەرامبەر هەستی، شەش پالۆیی بەرامبەر پێش هەستی (حدس). ئەرکە گرینگەکانی رۆشنبیری ملکەچ بوونی مرۆڤە بە دەستەلاتی شێوە بە کۆتاییەکانی ژیانی فیویاوی گەردوون کە ژیان جوانکاری دەکات بە بەکارهێنانی رێسای ئیستاتیکا ئەم رێسایە فاکتەری پێشکەوتنی مێژووییە، لێرەدا دەگەینە ئەو باوەڕە نەك ئەدەب و هونەر بنچینەی شیکردنەوەی ئیستاتیکان بەڵکو ماتماتیك، ئەندازە، فەلەك، پزیشکی،ئاریکچەر هەموویان هاوبەشی تەواوکەری رێسایەکانی ئیستاتیکان بە شێوەیەکی کارکردەو پەرچە کردار لەگەڵ هەستەوەرەکانی تاك.

هەڵوێستی جوانکاری لەرووی سایکۆلۆژییەوە دیارو بەرچاو نییە، لەم دەستەواژەی سەرەوە تەنیا ئەوە نەبێت کە باروکردەوەی دەروونی دەگرێتەوە خۆی ئەمەش لەسەر کۆڵەگەی بیردۆزی ستاتیکی دانراوە کە دەتوانێت کارێکی بەرجەستە بکەین (دووری ماددی، هوشیاری ئیستاتیکا، درك پێکردنی ئیستاتیکی) بە هۆی ئەمانەوە دەتوانرێت هەر بابەتێك بەرچاو بکەوێت بگۆڕدرێت بۆ بابەتی جوانکاری. واتە رەهەندی ماددی بۆ حاڵەتی هوشیاری ئیستاتیکا.بە بۆچوونی (ئەدوارد بولو) چەند نموونەیەکی هێناوەتەوە بۆ نرخاندنی مرۆڤ کە دیاردەی سروشتی لە جیاتی بەکارهێنانی ئەنجامگیری کاری هونەری هاوکێشە کرد. وەك ۆڤ کە سەیری تەم و تومان لە سەر دەریا دەکات هەست بە خۆشی و دڵڕفێنی دەکات، بەلاَم لە واقیع بوونی ئەم تەم و تومانە بارێکی ترسناکە بۆ راوچی و دەریاوان و گەشتیارەکان، واتە لە رەهەندی ماددی لە هەنگاوی یەکەم دا جیاکردنەوەی ئەم دیاردەیە لە خودی راستەقینەو واقیعی حاڵی خۆی، ئەمەش لەدەرەوەی پێداویستی وئامانجی ئێمە دەبێتلەرێگای سەیرکردنی بابەتی یان نرخاندنی هەر دیمەنێك و دەنگێك بە هاوکێشەی جوانی دووری لە رووداوی راستەقینەو بەرپەرچدانەوەی زەمەنەکە کە





بۆ بارێکی دەروونی ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە لە ئیستاتیکا پێی دەڵێن زیادەڕۆیی یان کەمڕۆیی لە رەهەندەکانی بینین. سایکۆلۆجیستەکان وای بۆ دەچن کە هزری جوانکاری دەتوانرێت سنوور بەند بکرێت لەسەر بنچینەی ئیدراك و بایەخی بێ سوود، یان کێشەی هزری بێ سوود.

لەم کاتەدا یەکانگیری جوانی بایەخ دانی بێ سوودەکە هیچ مەبەستێکی دەرەکی نییە و دوورە لە مۆرفۆلۆجی هزر کە سۆزانە (عاتفیانە) لەگەڵ بابەتەکان یەك دەگرێتەوە بۆ هوشیار بوونەوەو تێڕامان لە پێناوی خود، بۆ نموونە لە هەڵوێستی مەعریفی ئیستاتیکادا وا دابنێت کەسێك گوێ لە مۆسیقا دەگرێت نۆتەکانی شی دەکاتەوە بۆ تاقی کردنەوە کە بەمەبەستی سوودی بەرامبەر خود دادەنرێت، لەهەمان کاتدا کەسێك گوێ لە هەمان مۆسیقا دەگرێ بە مەبەستی هاوسەنگی و هارمۆنی دەروونی و زاخاوی مێشك ئەمە بێ سوودی بەرامبەر بابەتێکە، یاخود کەسێك بەرامبەر تابلۆیەکی زەیتی تێڕامان دەکات فیگەری دەم و چاوێك لە ناو تابلۆیەکدا بە کەسێکی برادەر دەشوبهێنێ لەناو تابلۆیەکەدا خالی مەعریفی تەنیا بیرکردنەوەیە لەو برادەرە یاخود بۆ چەند ساتێك دادەمێنێ و چیرۆك و نوکتەی ئەم برادەرەی بیردێتەوە واتە ئەم تابلۆیە بەرامبەر ئەو کەسە لە سنووری ئیستاتیکا دەردەچێت و دەبێتە هەڵوێستی سوودی بەرامبەر خود، چونکە ئەم تابلۆیە هۆیەکە (وسیلە) بۆ داهێنان و وشەو بیریادی ئەو کەسە، رێبازی گونجاو (توفیق) لە ئیستاتیکا وا دەبینرێ کاتێ تێکستێکی ئەدەبی دەخوێنیتەوە وا دەزانی مێژوو یان رەخنەی کۆمەلاَیەتییە یان بارێکە لە بارە هەڵچوونە هیستریەکانی نووسەر یان کێشەی ئازاد (تداعی الحر) یان فکرە بەبێ قەیدو شەرت. ئەو کاتە بایەخێکی ناجوانکارییە بەم دەقە ئەدەبییە،ئەم تیۆرە وا دەبینێ بەرهەمی دەقی هونەری یان دەقێکی بابەتی کۆمەلاَیەتی لەوانەیە لە سنووری ئیستاتیکا کۆنەکرابێتەوە تەنیا بایەخێکی سوودی بێت،چونکە زۆرجار یەك دەقی بابەتیی جارێك جوانکارییە جارێکی تر لە زەمەن و شوێنێکی جیاواز جوانکاری نییە، ئەو کەسەی کەوا سەیری

کەسی ناو تابلۆیەکە دەکات لەگەڵ ئەو کەسەی کەوا بیرەوەری دەگێڕێتەوە یان ئەو کەسەی گوێ لە مۆسیقا دەگرێ بۆ مەبەستی تاقی کردنەوە لەگەڵ ئەو کەسەی بۆ هارمۆنی و چێژ گوێی لێ دەگرێ هەمان پاڵنەرە وا لەو دوو جۆرە کەسە دەکات گوێ بیستی یان بینینی ئەم کارە هونەرییە بێت، بەلام لە دوو حاڵەتی جیاواز و سۆنگەی سوودمەندی (بابەتی و خودی) بۆ هۆشیاری ماددی ئیستاتیکا چونکە ئەو دوو کەسە چێژ و بێزاری لە کاری هونەری لەیەك زەمەنی جووڵاو دەست پێ دەکات، واتە سەیر کردن لە دەقی ئەدەبی و هونەری و مۆسیقی لەیەك رەهەندەوەو فەرامۆش کردنی لایەنەکانی تری بابەتەکە، سایکۆلۆجستەکانی فەسلەجە دەڵێن دوو جۆر ئیدراك کردن هەیە (بینینی تایبەتی و بینینی گشتی) واتە شێوەی ئیدراکی ئیستاتیکی و شێوە ئیدراکی نا ئیستاتیکی. ئیدراکی نا ئیستاتیکی پێی دەوترێت (تێبینی کردن) لەسەر دەقە هونەرییەکان بۆ بەرژەوەندی سوودی خود، بەلام ئیدراکی ئیستاتیکی بۆ دەقە هونەرییەکان پێی دەوترێت تێگەیشتن (الفهم) لە دەقە هونەرییەکان، سایکۆ- فیزیك لەم بارەیەوە دەڵێت، جۆری تێبینی لەسەر دەقە هونەرییەکان کارێکی فیزیکی دەماغی ئەو کەسەیە بۆ بەرامبەرەکەی واتە گەڕانەوە بۆ یاساکانی سروشت، بەلام جۆری تێگەیشتن بابەتی جوانکارییە یان هەردووکی فیزیاوی- جوانی لەیەك گرتەی بینین و هەستەکانی مێشك دەبێت بۆ نموونە کاتێ رۆژ لە قەراغی ئاپارتمانە بەرزەکانی شار لە ئاوابەندایە یان گزنگی بەیانە، جوانترە لەوەی بەتەنیا سەیری ئەو رۆژە بکەین ئەو جوانییە ئاپارتمان دروستی کردووە کە بینینی ئێمە لە رۆژەکەدا (خۆرەکەدا) دەیبینێ ئاپارتمان دەبێتە فیزیاوی و رۆژەکە دەبێتە بابەتی جوانی کە تەواوکەری یەکترن بۆ دروست کردنی دەقێکی ئیستاتیکی. کاری هونەری وەك بابەتی جوانی یان بابەتی رەخنە ئامێز پێکهاتەیەکی ئاڵۆزە لە سیفەتەکانی بابەتی پێك دێت، کە بەهۆی هەستەوەرەکان دەرکی پێ دەکەین و ئەو سیفەتانە هەڵگری جوانکارین لە دەقی هونەری. لە رووی دەروونییەوە ئیدراکی جوانی لە دەقی هونەری بە شێوەی سەرەکی هەست کردنە بە





سیفەتی ئیستاتیکی کە ئیدراك لەم بوارە بە شێوەی گشتی (شمولیە) دەگرێتەوە بۆ بەکارهێنان کە چەند کەرەستەیەکی پرۆسەی هزری دەگرێتە خۆ. لە جیاتی ئەوەی گرتە ئیستاتیکیەکان لە ژێر کۆنترۆڵی هەستی بینین و بیستن کار بکەن.خەسڵەتە سۆزیەکان لە رێگای هەستەوەرەکانەوە جوانکاری دەوروژێنێت بەشێوەیەکی بابەتی لەماوەی فۆرمی گشتی بۆ کارە هونەرییەکان. گەلێ جار کاری ئیستاتیکی کاریگەرو دڵخۆشکەرو تراژیدییە بۆ ئەو کەسەی کەوا پەرچەکرداری هەیە بۆیە تاوانی سۆزی بۆ ئەو کارانە بەهای ئیستاتیکی زیاد دەکاتلە کاتی نەمانی رەهەندەکانی هزر بە شێوەیەکی وروژێنەر دەچێتە جیهانی تایبەتی ناوەوەی نووسەری دەقی هونەری. وەك ئەو مامەڵە لەگەڵ کەرستەکانی هونەری ئیستاتیکا دەکات.

لەزێدەیی تیۆری دەربڕین لە کاتی خوێندنەوەی دەق لەو زەمەنەی هەست بە جوانی دەق دەکەین لە هەمان کات هەستێکی ئاکاری دەمانوروژێنێت بەرامبەر خودی نووسەری دەق کە بە شێوەیەکی ویژدان (بەرزەمەن) مامەڵەی لەگەڵ بکەین کەوا ئازارو کێشەکانی نووسەر لە رێگای دەربڕین، جوانکاری هونەری دەخولقێنن.

لە ئەم دەربڕینە سەربەخۆیە بەرامبەر بە داهێنەری دەق رەنگە وا دابنێیت لە کاتی خوێندنەوەی هونراوەیەك هەست بکەین تەنیا وشە ریزکردنە سفستائیانە قسە ریزکردنی نووسەرە، بەلام لە دووامانا (میتامانا) داهێنانێکی بابەتی دوور لە باسخوازی خودی نووسەر. سایکۆ- ئیستاتیکای هۆنراوەو شێوەکاری مانای کار ئەزموونی ناوەوە کە هەست بکەیت خۆت شاعیر یان وێنەکێشی گوزارشت لە ئێش و ئازارەکانی کەسێتی ناوەوەت دەکات (ئەو،Id) ئەمەش سەرسام بوونە بەرامبەر پەرەگرافێکی دەقێکی هەڵبژێردراو یان تابلۆیەك لە نێوان سەدان تابلۆی تر. لەو کاتە هاوکێشەی ئیستاتیکا دەبێتە هونەر گوزارشت لە سۆزو ویژدان دەکات چونکە هەست بە فیگەری دەق دەکەین لە کاتی خوێندنەوەی دەق ژانێکی تری دروست بوونەوە روودەدات. کاتێ شاعیر بەرامبەر مانگ کڕنۆش دەبات و وەسفی جوانی خۆشەویستەکەی پێ دەکات ئەوا کاری میتاپۆلیزمی ئیستاتیکی لە هزری ناوەوەی

روو دەدات لە بەهای مانگ کەم دەکاتەوە بوونی مانگ ون دەکات ئەو کچەی کە وێنەی لە خەیاڵیدایە لە شێوەی مانگ دروستی دەکات ئەوا ئیستاتیکای هۆنراوە هی مانگە نەك وشەکانی نووسەر. کاتێ گوێبیستی پارچەیەك مۆسیقای غەمگین دەبین بە شێوەی سۆزو ویژدانانە دڵ تەنگ و غەمبار دەبین یان لە کاتی سکونی بەدەن دا گوێ بیستی مۆسیقای جاز دەبین هەموو ئەندامەکانی لەش دەکەونە جووڵەی هارمۆنی سەربەخۆ لەسەر ئیقاعی مۆسیقاکە جۆرە ئیستاتیکایەك دەبەخشێت بە دەقی مۆسیقایەکە. غەمگینی بەرامبەر مۆسیقا وەك رەنگی سور بەرامبەر سێو وایە کە جوانی و رازاوەیی دەبەخشێت بە پرۆسەی خواردن نەك وەك حەوانەوەو چێژ وەرگرتن لە خۆشاوی سێو.ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ تێگەیشتن لە مۆسیقا کێشەی ئەرك و فرمانی مێشکە بۆ مەبەستی جیاکردنەوەی سیفەتی جوانکاری، بەڵکو کارە هونەرییەکە خۆی بابەتێکی سەربەخۆیە لە دەرەوەی هزری ئێمە کار دەکات لە کاتێکی بەسەرچوو کە هزری تێڕامان لە مرۆڤ دروست دەکات، چونکە گوزارشتی مۆسیقا کارێکی ئەدەبییەو گرنگی ئەو بەرهەمە دەوەستێتە سەر تەرزی هەستی کە لێی ئاگادار دەبینەوە.خەسڵەتی جوانکاری داواکراو یان دیاریکراو لە بەرهەمێکی ئەدەبی ناتوانرێ رێك پێناسە بکرێت وەك هاوکێشەی ماتماتیکی، چونکە گواستنەوەی هێڵەکانی هونەری سەرکەوتوو بە گەێرەی هەست و ئیدراکی ئەو کەسە پێوەر دەکرێت واتە پێوەری هەست کردن بە سایکۆ- ئیستاتیکی هونەر لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت بە پێی پێوەری (هەستەوەرە باڵاکان و رۆشنبیری و کەسێتی و ژینگە....)ی ئەو کەسەئیستاتیکا مۆسیقا کارێکی ناوەوەی مرۆڤە هەستی پێ دەکەین وەك ویژدانێکی بزوێنەر، بەڵام هەڵوێست دیاری ناکات.تابلۆی شێوەکاری هەستی پێ ناکەین وەك گوزارشت کردن، بەڵام هەڵوێستی هونەرمەند دیاری دەکات. هەموو بیردۆزەکانی ئیستاتیکا لەسەر ئەوە رێکن کەوا تابلۆ و سیمفۆنیا جۆرێك لە رەسەن و نایابی هونەر دەگرێتە خۆ کە هەستێکی راستگۆیانە لای تاك دروست دەکات بە بەردەوامی دەیوروژێنێت واتە ( وروژاندن + بیرهاتنەوە— وەڵام دانەوە +





گوزارشت لە سۆز)هیچ کاتێك ناتوانیت ئاوازە چوارینەکەی بتهۆڤن هەزم بکەین ئەگەر لە سۆزو ئاهەکانی دانەر ئاگادار نەبیت بۆ نموونە، کارێکی هونەری سیفەتێکی عاتیفی گرتۆتە خۆ وەك دڵتەنگی و دڵخۆشی.

ئەو دەقە هونەرییە چەند فاکتەرێکی تایبەتی هەیە تێکەڵ دەبن و کارلێك دەکەن وەك هێڵ و رەنگ لە تابلۆدا ئەوەش کیانی ئیستاتیکایە لەو دەقە هونەرییەدا رەخنەگری هونەری چوارچێوەی ئیستاتیکا دیار دەکات رەخنەگر لە ژێر کاریگەری چ هزرێك بێت ئەوا ئەو دەقە بەرەو ئاقاری ئەم هزرە دەبات، رەخنەگری سروشتی لە تابلۆی (سیزان) ناتوانێت هەمان تیۆری مەعریفی (ئەبستمۆلۆژیا) پەیڕەو بکات لە هەڵسەنگاندنی تابلۆی (دواین ئێوارە، عشا الاخیر)ی داڤینشی، کاتێ رەخنەگری ئیستاتیکی شاکاری هونەری بەرەو ئاقاری ئاکاری دەبات وەك هەڵوێستی ئاکاری دینی و فەلسەفی و ئەمەش لە ئەبستمۆلۆژیادا نازانستی و نا ژیربێژییە لە رەخنەگرتن چونکە رەهەندەکانی داهێنان دەبەزێنێ، گرینگ ترین فاکتەر لە سایکۆ- ئیستاتیکادا ئەوەیە کەوا رەخنەگر مامەڵەی بابەتی ئامانجکاری لەگەڵ دەقە هونەرییەکان بکات و رەهەندێکی رەسەنایەتی پێ ببەخشێ ئەو کاتە داوا لە هونەرمەند دەکرێ کەوا دیاردە سەرەکییەکان ئاشکرا بکات بۆ ئەوەی هێزی ئەندێشەی هونەرمەند بەدیار بکەوێ.پایە بەرزی هونەرمەند تەنیا بەوە دەرناکەوێ کەوا رێگایەکی یان شێوازێك یان نۆتەیەکی تازەی داهێناوە یا ئەو هونەرە سەرکەوتووە لەبەر ئەوەی سەر بە رێبازی رۆژئاواییە.پایەبەرزی کاری هونەری بەوەوە سەردەکەوێ کە جێگایەکی لە بیناسازی ژیربێژی لە بونیادی ژیانی مرۆڤ دروست بکات ئەو کارە هونەرییە بۆیە سەرکەوتووە،چونکە چەند شتێکی لە رووحی مرۆڤایەتی تێدایە و پێوەندییە رووحییە زانستییەکان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و شارستانییەتەکانی گێتی دروست دەکات هاوکێشەیەکی بەردەوام لە نێوان هزری بونیادی شارستانییەتەکان دروست دەکات و رەوشتێکی بەردەوامی مرۆڤایەتی پەیدا دەکات واتە بە وتەی سایکۆلۆژستەکان کاری ئەدەبی و دەقی هونەری بەوە رەسەن و بەرزە کە لە

هاوکێشەیسەوداو مامەڵە و کالاوە رزگار دەکرێ و دەکرێت بە کارێکی مرۆڤی، رەهەندەکانی پەیوەندی مێژووی دیالیکتێکی بەرەو پێش دەبات فەلسەفەی جەدەلی ئیستاتیکا دروست دەبێت لە مێژووی پێشکەوتنی چێژە مرۆڤایەتییەکان ئیستاتیکای کوردی لە زاق و زیقی میزاجی تاکە کەسی رزگاری نەبووە ئەمەش هەموو دەقە ئەدەبیەکان تەجاوزی پێنج هەستەوەرەکانی مرۆڤیان کردووە نەبۆتە حاڵەتێکی ناخ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر پێوەری هەستی جوانکاری بگۆڕێت، بەڵکو هەموو تێکستەکان و تابلۆو ئاوازەکان لە ژێر گوشاری ئایدۆلۆژییە تایبەتییەکان کاری ئاسای خۆی کردووە کاتێ کورد ئاشنای ئەدەبی هاوچەرخ و تێکەڵی سرووتی گەلانی دەوروبەر بووە ئەو کاتە جووڵەی ئیستاتیکی لە هونەری کوردی رەنگی دایەوەو کێشەی فەلسەفی پەیدا بوو،بەلام هیچ کاتێك نەگەیشتۆتە ئاستی پەیدا کردنی دیالۆگی هونەری لەگەڵ هونەری گەلانی دەوروبەر هەموو هونەرەکان لە دیدگایەکی بچووکەوە خەونەکانیان داڕشتووە، لە کێشەی تایبەتییەکان دەستی پێ کردووە، هەموو فاکتەرەکانی ئیستاتیکای کوردی خەیاڵ ئامێز بووە گەلێ جار بۆ چێژ وەرگرتن لە داستان و ئەفسانە سنووری پێنج هەستەوەری مرۆڤی بەزاندووەو ئیستاتیکاش لە هالأوی ئەم ئەفسانانە چێژوەرگرتوو بووە. هزری ئیستاتیکا لای رۆشنبیری کورد سەرەتای لێك دانەوەی هزری هونەری بووە بۆ تێفکرین لای کورد واتە گەڕانە بۆ سروشت.هەموو سروشتەکانی وەحی لە خوودەوە وەردەگرن بۆ کارلێکی رووحی بەرەو سروشت ئەمیش بە دوو دیدگاوە ئیلتیزامی دەکرد.

یەکەم:وەك ئینتمای رووحی خاك و نیشتمان هەموو پێوەرەکانی زانستی جوانی لای ئەو دواندنی سروشتی دەوروبەری بووە چ وەك مامەڵە کردن لەگەڵ جوانی ئەو کە خۆی بە بەشێك لە ماددەو رووحیەتی سروشت دادەنا لە بۆچوونەکانی ستایشی دەکرد.

دووەم: وەك چوونە ناوکایەی جوانی سروشت گۆڕینی رەهەندەکانی ئەم سروشتە چ سروشتی خاك بێت یان مرۆڤ لای هونەرمەندی کورد ئەوە بووە بوارێك بۆ تێڕامان





و بیرکردنەوەی بێ سنوور بدۆزێتەوەو شتێك بڵێ و بنووسێتەوە ئەویش قابیلی رەخنە نەبێت و هەڕەمەکی داهێنان بکات. لە سەرەتای دەق بەندی کوردی هیچی وەك (بابەتاهیری هەمەدان) مەستی سیحری سروشت نەبووە وە سفسگائیانە ستایشی سروشتی داهێنەرەکەی کردووە. بەلام (ئەحمەد موختار جاف) ئیستاتیکای سروشتی بۆ مەبەستی خود گەلی بەکاردەهێنا لە پاڵ ئیلهامی ئیستاتیکی ماددیانە کەوتە باس کردنی سروشتی باری کۆمەلأیەتی گەلێ جار لە چوارچێوەی هونەری جوانی دەردەچوو بەرەو رەخنەی دابونەریتی کۆمەلأیەتی و ئێش و ئازارەکانی.

مێژووی ئیستاتیکای کورد لە (مانا فکتوریای) دەستی سەری هەڵدا بۆ رستن و چنینی تابلۆی غەریزی جوانکاری. کە هەر جۆرێك گوزارشتی لە بۆچوونی نوچەیەك دەکرد ناسنامەی ئەو ناوچەی دەردەخست، بەلام ئەوەی مەبەستی ئێمەیە گەڕانە بە دوای خودی ون بووی هونەری کوردی لەگەڵ مامەڵەکردنی ئێش و ئازارەکان جوانکاری دروست بکات فەلسەفەی سەلماندن بخولقێنێ کارە ناباو و ناپەسندی کۆمەڵ هەڵگەڕێنێتەوە بۆ کاری رەخنەسازی لە خودەوە بۆ خودگەلی، لە تاکەوە بۆ کۆمەڵ مامەڵە کردن لەگەڵ موفرەداتی ماناکانی ئیستاتیکا بە شێوەیەکی زانستی و سایکۆلۆژی کە ئەمەش کەس نەیتوانیوە بوێرانە خۆی لەم کەنارە بدات تەنیا (شێرزاد حەسەن) نەبێت کە رێبازی (سایکۆ- ستۆری) گرتەبەر ئیستاتیکای ناخی خودهەرچەندە چیرۆکنووس نوقمی کێشە سایکۆلۆژیەکانی تاك بووە تووشی حاڵەتی داچەپاندنی پۆزەتیفانە بووە تاماوەیەك تارمایی ئەم بوحرانە هەر مابوو بەسەریەوە، بەلام دۆزینەوەی رەهەندەکانی پەیوەندی سایکۆ-ئیستاتیکا لە (گوڵی رەش)ی (شێرزاد حەسەن) سەری هەڵدا چونکە هەموو کێشەکان لە تیۆری فەلسەفەی جوانی لەتاکەوە دەست پێ دەکات و چەکەرەی دادەنێت، بەلام لە (گەڕەکی داهۆڵەکان)هەرچەندە وەسفی سایکۆلۆژی زاڵە بەسەر فاکتەرەکانی ئیستاتیکا و جوانکاری لەم رووەوە دەبێتە جەدەلی شاراوە بگرە ((ئازاد شوقی)) شێوەکار لە دووری جوانی (بعد الجمالی) گەڕاوەتەوە سەر ئاخاوتن لەگەڵ سروشت،

دووبارە بوونەوەی ئیستاتیکا، بەلاّم دیالۆگ دروست کردن لەگەڵ خودی ون بوو تەنیا لای (وەهبی رسوولّ) دەردەکەویّت هەموو ئیستاتیکای هیّلّ و رەنگی گەڕاندۆتەوە بۆ فۆرمی سەرەتایی، بەلاّم نەیتوانیوە (ئەو، Id)ی خۆی بۆ زەمەنیّکی رابردوو پاشەکشیّ پیّ بکات لە تابلۆیەکانی تەنیا خۆ خنکاندنیّکی خودییە لە زەمەنیّکی بەسەر چوو. زۆر نموونەی تر بویّری ئیستاتیکان بۆ شیکردنەوەی دیالیکتیّکی جوانکاری هونەری کوردی بنچینەی سەرەکی ئیستاتیکای هونەری کوردی رەخنەی هونەرییە چونکە تا ئاقاری میّژووی ئەمڕۆمان ئیستاتیکای کوردی بەندە لەسەر دوو رەهەندی زەمەنی: یەکەم: میزاجی هونەری چیّژ وەرگرتن بەپیّی بۆچوونەکان و مەیل نەك بە پیّوەری زانستی هەستەوەرە بالاّیەکان کە کاریّکی بایۆ- فەسلّەجی دەکاتە سەر هەزم کردنی کارە هونەرییەکان.

دووەم: رەسەنایەتی هونەری بەپیّی ئەم تیۆرە هەموو کارە هونەرییەکان دەبیّهەلگری مۆرکی کوردەواری بیّت، هەموو دوقە هونەرییەکانی زەمەنی ئیستاتیکا نزیك بوونەوەیە لە دیالۆگی هونەری هاوچەرخ، بەلاّم بازدان بەسەر پرەنسیبەکانی قۆناغی رەخنەی هونەری فۆرمی ئیستاتیکا دەبیّتە کاریّکی تاکە کەسی لە قەوارەی هزرو خودمانای شاعیر دەرناچیّت...



## سەرچاوەکان


١- جورج سانتیانا.الاحساس بالجمال. ترجمة د. محمد مصطفى بدوي، قاهرة.

٢- ف. أنجلز.الثورةوالثورة المضادة في ألمانيا، منشورات دار دمشق ١٩٦٥.

٣- ف. لينين. في الثقافة البروليتارية، الؤلفات الكاملة باريس-موسكو مجلد٣١-١٩٦٨.





٤- ماوتسي تونط.حول الديمقراطيةالجديدة، دار النشرباللغات الاجنبية بكين١٩٦٨.

٥- كارل ماركس. بؤس الفلسفة، المنشورات الاجتماعية باريس ١٩٦٩.

٦- أوفسيافيكون. الجمال في تفسيه الماركسي،ترجمة د.بدرالدين السباعي، دار الجماهير دمشق ١٩٧٠.

٧-هيربرت ريد. التربية عن طريق الفن ، ترجمة عبدالعزيز ضاويد و مصطفى حبيب، الهيئة العامة للكتب و الاجهزة العلمية جامعة قاهيرة ١٩٧٠.

٨- عبدالحليم محمود سيد. الابداع و الشخصية الجمالية،دار المعارف بمصر ١٩٧١.

٩- هيربرت ريد، الفن و المجتمع، ترجمة فارس مترى ظاهري،دارالقلم بيروت ١٩٧٥.

١٠- لويس هورنيك. فلسفة الجمال .ترجمة مصطفى ماهر،دار الفن الحديث دمشق ١٩٧٥.

١١- هيغل. مدخل الى علم الجمال، ترجمة محي الدين ججمى،دار الطليعة بيروت ١٩٧٧.

١٢- كمال ميراودةلى. ئيستاتيكا، ضاثخانةى زانكؤ سليمانى ١٩٧٩.

١٣- سغموند فرويد. التحليل النفسي داظينشي، ترجمة د. فؤاد عبد علي، دار الملاين بيروت ١٩٧٩.





١٤-وليام بارنيز. علم النفس التجريبي، ترجمة د. حلمي نجم،دار الرشيد للنشر، بغداد ١٩٨١.

١٥- قاسم حسين صالح. الابداع في الفن، دار الرشيد للنشر، بغداد ١٩٨١.

١٦- د.حلمي مرزوق. الرومانتيكيةوالواقعية في الادب، دار النهضة العربية بيروت ١٩٨٣.

١٧- جون راندال، التكوين الجمالي للفن،ترجمة محمد خيري،قاهيرة دار المعارف ١٩٨٣.

١٨- ماري أندرسون. علم النفس الجمالي، ترجمة قاسم عبود، دار الحوار دمشق ١٩٨٦.

١٩- سونيا هانت و جينيفر. نمو شخصية الفرد و الخبرة الاجتماعية ، ترجمة د. قيس النوري،بغداد ١٩٨٨.

٢٠- رامان ژمارە (٨) ١٩٩٧ چاوپیّکەوتن لەگەڵ شیّرزاد حەسەن — ل ٥٠.

# سایكۆلۆژیای دەمارگیری لەژێر كاریگەریی فێربووندا

رشیالیزم وەك پرسێكی دیالیكتیكی مێژوویی، فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیا و ئەدەبی هاوچەرخ و ئەنتەرنێت و جیهانگیری نەیانتوانی ڕەهەندەكانی رشیالیزم ((دەمارگیری، تعصب)) بگۆڕن و بەلایەكدا بڕوات، بەڵام بە ئاراستەی كات (زەمەن ) هاوتەریب لەگەڵ مەزهەب و ئایدیۆلۆژیا و زانست و فەلسەفە و خواستی تاكە كەسی جووڵاوەتەوە لەگەڵ ئەمانەدا دەمارگیری گەورە بووەو چەكەرەی كردووەو بۆتە غەریزەیەكی سایكۆلۆژیی ڕەهەندێكی فیكری. رشیالیزم وەك (هاردینج) دیاری دەكات ئەو كۆمەڵە یان گرووپە كەسەن كە لەناو خۆیاندا هەندێك ڕەوشتی تایبەتمەندی كەسایەتی بەیەكەوەیان كۆدەكاتەوە، فاكتەری بەیەكەوە ژیانی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە بەم فاكتەرە تایبەتمەندە خۆیان لە خەڵكانی تر لە



هەموو ڕوویەكەوە وا لێكی دەدەنەوە جیاوازن وەك جیاوازی لە ( ڕاڕاوەی ئاینزا، زمان، ڕەچەڵەك، نەتەوە، كلتوور، داب و نەریت، ڕەفتار، كەسایەتی حاڵی گونجانی دەروونی...﴾هەروەها (هاردینج) وای دەردەخات كە ئاراستەی ڕەگەزپەرستی ئاراستەی ئەو كۆمەڵانە دەردەخات بەرامبەر كۆمەڵێكی تر كە ناچێتەوە سەر ڕەگەزو نەتەوەی ئەو كۆمەڵە جا چ هاوكێشەكە نێگەتیف بێت یان پۆزەتیف، ئەگەر نەگەتیف بوو بەرامبەر كەسانی تر ئەوا ئەو ئاراستەیە ڕووكاری دەمارگیری و ڕەگەز پەرستی دەنوێنێت و دەمارگیری ئەو ڕەوشتە دژایەتییە بەرامبەر كەسێك كە ناچێتە سەر كۆمەڵی ئەوان، بەڵكو لە كۆمەڵێكی ترەو گەلێك جار بەبێ هیچ هۆیەكی ڕاست و لۆژیكی ئەم دژایەتییە دروست دەبێت. هەموو كاتێك دەمارگیری نەتەوایەتی یەكێكە لە تەنگوچەڵەمە گشتییەكان كە كار دەكاتە سەر ڕەوشتی پێوەندییەكان كە لە نێوان تاكەكانی كۆمەڵدا هەیە. كاریش دەكاتە سەر ئاستی بەهێزی یەكگرتنی كۆمەڵ. ئەم دیاردەیەش زۆر بەزەقی لەنێو دەوڵەتاندا دیارە كە ڕشیالیزمن زیاتر بەرامبەر بێ هێزەكان، كەمینەكان بەكار دەهێنن كە لە چەند سیفاتێكی جەستەسی و ڕەچەڵەكی و ڕەگەزی لەیەكتر جیاوازن و لایان گەلاڵە بووە، كە ئەم گەلە بێ هێزە پلە دوون و بۆ خزمەتی ئەوان دروست بوون یان لەسەر خاكی ئەواندا بێگانەن. ئەو فاكتەرانەی كە دەبنە هۆی ڕەگەز پەرستی دوو جۆرن، جۆرێكیان بە خودی تاك بەستراوەتەوەو جۆرێكی تر بە كۆمەڵەوە. ئەو فاكتەرەی بەتاكەوە بەستراوەتەوە پێویستی دەروونی و ڕەمەكی و فێڵی دەروونی دەگرێتە خۆ كە تاك بەرامبەر كەسانی تر دەری دەبڕێت، ئەوەش كارێكی ناهەستییە كە پاڵ بەتاكەوە دەنێت تا دەمارگیری لە خودی خۆیدا چەكەرە بكات، چونكە ئەو پێویستییانەی كە لایان تاك تێر نەكراون ئەوا هەوڵی ئەوە دەدات بەهەر ڕێگایەك بێت ئەگەر لەسەر مافی خودی كەسانی تریش بێت و لە كۆتاییدا یەكێك دەكاتە كۆچی قوربانیی ویستی غەریزەكانی، بەڵام گرنگترین ئەو فاكتەرانەی كەوا بەكۆمەڵەوەبەستراوە زیاتر ڕەوشی خێزان دەگرێتەوە وەك یەكەی پێكهاتەی

کۆمـەڵ.پرۆسـەی دەمارگیریشـی کـارێکی گـەورە دەکاتـە سـەر خـێزان و وادەکـات ئاراسـتەیەك لـەم خـێزانە دروست بێت کە رەوشتێکی جێگیرەو ئەم رەوشتە رەگ و ریشـەی سیاسـی و ئـابووری لـە رەهەندەکانی دەمارگیریدا هەیە. ئاراستەو دەمارگیری لـە شـیکردنەوەدا دوو شـتی یـەك مەبەسـتن.فاکتـەرەکانی دروست بوونـی ئاراسـتەی هـەمان فاکتـەری بنچینەی دروسـتبوونی دەمـارگیرین ئەویش رەهەندی مەعریفییە کـە بریتیـیە لـە ﴿ هەسـتە بەرجەسـتەکراوەکان، مەزەنـدەکـراوەکان، پـێکهاتەکان﴾، بـەلاَم رەهـەندی سـۆزی ویژدانـی بریتیـیە لـە (ئاگـاو هەسـت). رەوشـتی دەمـارگیری بریتیـیە لـە رووکـاری رەگـەز پەرسـتیی نێگەتـیف کـە لـە ئـەنجامی کـار لێك کردن و مامەڵـەی تـاك لەگـەڵ دەوروبـەرو دەوڵـەتدا.سایکۆلۆجسـتەکان لـە ئـەنجامی تاقیکردنەوەی بـەردەوامدا لـە نـێوان ئـەو گەل و نەتەوانەی دوو جۆرن و لە سنوور بـەدێکدا دەژیـن دەرکـەوتووە کە لە٦٩ نـێوان پلـەی وشیاری و تەمەنی کاتی منداڵیدا پـێوەندی هەیـە و کـێرڤی تاقـیکردنەوەکە ئـەوە نیشان دەدات پلەی بەرزیی وشیاری کە رەوشـتی دەمـارگیری هەیـە دوای تەمـەنی (٤) ساڵانەی منداڵ دەردەکەوێت. لەم لێکۆڵینەوەشـدا دەرکـەوتووە کـە لـە (٨٠٪) مـنداڵانی رەش پێـست حـەز دەکەن گەمە بـەو لەیستۆکانە بکەن کە رەنگیان تۆخ و نزیك لە رەنگی خۆیانن و (٩٢٪) منداڵانی سپی پێست حـەز لـە یـاری ئـەو لەیستۆکانە دەکـەن کـە رەنگـی سـوور یان شین یان سـپییە، بـەلاَم لەهـەمان کـاتدا دەرکـەوتووە کـە (٨٤٪)ی رەش پێـستەکان هەسـتێکی پۆزەتـیڤانەیان هەیـە بەرامـبەر سـپی پێـستەکان، بـەلاَم (٧٣٪)ی سـپی پێـستەکان هەستێکی نەگەتیڤانەیان هەیە بەرامبەر رەشەکان.

## قۆناغەکانی دەمارگیری

١- قۆنـاغی هەست کردن:لەم قۆناغەدا تاك توانای ئەوەی هەیە کە جیاوازی لەنێوان ئـەو کەسـانەدا بکـات کـە لـە رەچـەڵەکی ئـەو نـین لەگـەڵ ئەوانـەی دەچـنەوە سـەر رەچەڵەکی ئەو واتە هەستی دەمارگیریی سەرەتایی.



٢-قۆنـاغی وێك هاتن یان هەڵگرتن یان توانەوە:لەم قۆناغەدا تاك دەچێتە ناویان و لەناو ئەو کۆمەڵەدا دەتوێتەوە کەلە رەچەڵکی خۆیەتی.

٣- قۆنـاغی هەڵسـەنگاندن: ئەمـەش بـە وەلاَم دانەوەیـەکی وروژانـدنـی دەمـارگیری دەبێت بەرامـبەر ئەو کۆمەڵەی کە خۆی ئینتمای بۆی نییە (خۆ لەگەڵ خستن) ئەم زاراوەیـە ((هـنری مـورای))بـەکاری هێـناوە بـەمانای دروست کردنی پێوەندیی باش لەگەڵ تاکەکانی ناو کۆمەڵداو چوونە ناویان﴾.

## جیاوازیی لەنێوان دەمارگیریی نەتەوایەتی و ئاراستەی نەتەوایەتی

ئاراستە لە رووی سایکۆلۆژییەوە واتە:

١بارێکی دەروونییە کە بارگەیەکی تاوگیری هەڵچوونی لەگەڵدا دەبێت.

٢ئاراستە حوکمدانە لەسەر بابەتێك کە حوکمێکی پۆزەتیڤانەیە.

٣ئاراستە هەمیشە لەگەڵ هەڵوێستی و بۆچوونی گشتیدا دەبێت.

بەلاَم دەمارگیری نەتەوایەتی لە رووی سایکۆلۆژییەوە بریتییە لە:

١رووکارێکی نەگەتیڤانەی رەگەز پەرستانەیە لە روانگەی هەڵوێستەوە.

٢دەمـارگیریی حوکمدانـی نەگەتـیف کـە بارگەیـەکی تـاوگیری هەڵچوونی بەهـێزی لەگەڵدا دەبێت.

٣دەتوانرێت دەمارگیری بگۆڕدرێت بە گۆڕینی ئاراستەی تاك ئەویش بەتێکەڵ بوون لەگەڵ کۆمەڵی بەرامبەر کە ئەم گۆڕانەش لەسەر بناغەی مەعریفی دەبێت.

## فێربوون لە روانگەی سایکۆلۆژییەوە

فێربوون پرۆسەیەکی سایکۆفیزیکییە لە کرداری مێشك بۆ دیاری کردنی گۆڕانی ڕەوشتی تاکی زیندوو چ لە پلەی مرۆڤدا بێت یان زیندەوەرەکانی تر واتە ئەو کردارە بایۆفیزیکە چ دەرەکی بێت یان ناوەکی کاردەکاتە سەر پرۆسەی مەعریفی و مێشك.مەبەستی ئەم پرۆسەیەش لە هەموو بارێکدا چ لەباری مرۆڤایەتییەوە بێت یان ئاژەڵییەوە دیاریکراوە،دوو فاکتەری سەرەکی هەیە بۆ فێربوون وەك:

١-پێگەیشتن و کامڵ بوونی تاك واتە هۆکاری ناوەوە (فسیۆلۆژیی تاك)، چونکە ئەگەر هۆکاری ناوەوە،هەر ئەندامێکی مێشك پێگەیشتوو نەبوو ئەوا فێربوون کردارێکی سەرنەکەوتوو دەبێت،یا تەمەنی گەشەی تاك هەرچەندە تەمەن و کامڵ بوون زیاد بێت کرداری فێربوون خێراترو سەرکەوتوو تر دەبێت، ئەو منداڵەی لە تەمەنی (١٢)ساڵان فێری شتەکان دەبێت توانای زیاترە لە توانای وەرگرتنی زانیاری لە منداڵێکی (٥) ساڵاندا.

فاکتەری دووەم: ژینگەو (دەوروبەرو راهاتن) وەك: خێزان، کۆڵان و قوتابخانە و گرووپی برادەران،راگەیاندن و دەوڵەت و سیستەمی کۆمەڵایەتی.....کە هۆکارێکی زیاتری فێربوونە،بریتییە لەو خێزانانەی کە پێوەندیی نێوان ئەندامەکانی شێوەی دیموکراسی و ئازادیی جووڵانەوەو بیرکردنەوەی تری بەخۆوە گرتبێت، ئەوا ئەو منداڵە زیاتر بواری فێربوونی دەبێت و ئامادەی دەروونی و هزری هەیە بۆ وەرگرتن ولێکدانەوەو تەرکیز کردن و تێبینی کردن لەسەر دەوروبەر، بەلاَم ئەو خێزانانەی کە سەرکۆنەی منداڵیان دەکەن و کۆت و بەندو کەتەلۆك بەندی بەسەر پێوەندیی ئەندامەکانییەوە ڕەنگ بداتەوە.ئەوا ئەو منداڵە تووشی گەڕانەوە و چەپاندنی بەردەوام دەبێت و توانای تەرکیز و تێبینی کەم دەبێت. ڕەوشتێکی تایبەتی وەردەگرێت بەهۆی سەرکۆنەکردن ئەویش یاخیبوون لە دەوروبەر هەروەها فێری لاساری دەبێت و منداڵێکی شەڕانی لێ دەردەچێت. ئەمەش بۆ جێگرتنەوەی دکتاتۆریەتی ماڵەوە. پراوەکردن دەورێکی گرینگی هەیە بۆ فێربوون، چونکە دەروونزانەکان سەلماندوویانە فێربوون لە ئەنجامی پراوەکردنی بەردەوامەوە





دەبێت. بۆ نموونە دوو منداڵی تەمەن (٧) مانگ یەکێکیان رۆژانە بۆ ماوەی یەك کاتژمێر لەسەر رۆیشتن کەشق دەکات و منداڵی دووەم وازی لێ دەهێنرێت، دوای (١٢) مانگی ئەزموون دەردەکەوێت منداڵی یەکەم دەتوانێت بەئاسانی هەڵسێت بە دیوارەوە بڕوات، بەلاَم منداڵی دووەم ناوێرێت، چونکە ترسی کەوتنی هەیە، ئەمەش ((سورندایك)) کردی بە یاساوناوی لێ نا (کاریگەریی مەشق کردن لەسەر فێربوون).

بەپێی ئەم یاسایەش دەرکەوت کە ئەو کەسانەی بە پەنجەکانیان پیانۆ دەژەنن بۆ کاری تایپێست سەرکەوتووترن یان ئەوانەی پایسکل دەزانن لە مەکینەی دروومانی سەرکەوتووترن یان ئەوانەی کوردن زووتر فێری زمانی فارسی و هیندی دەبن، چونکە سەر بە یەك خێزانن.واتە فێربوون بریتییە لە کارلێکردنی تایبەتمەندی ناوەوەی دەروونی لەگەڵ دەوروبەردا (ژینگە) و فێربوون لە رووی زانستییەوە ئەوە دەگەیەنێت لە ئەنجامی (دەمودوو) و (پاڵەوتەی فێربوون) بەهۆی دەمودووی گشتی لە پێناوی فێربوونی چاك و تێبینی کردنی دەم و دووی تاك بەرەو رەوشتێکی دیاریکراو یان راهێنانی تر. فێربوون ئەو پرۆسەیە یان بنچینەی بیردۆزێکی زانستییە کە لەو رێگایەوە دەتوانرێت دەست بەسەر ئەم پرۆسەیەدا بگرێت و بەهۆی دووبارە کردنەوەی پرۆڤە لە کردار دەتوانین پرۆسەی فێربوون بەمە لێك بدەینەوە کە دوور کەوتنەوەیە لە زۆرترین هەڵەو دەستکەوتنی ئەنجامی فێربوون لە کەمترین کاتدا، بەلاَم لاسایی کردنەوە جیاوازە لەگەڵ فێربوون، چونکە لاسایی کردنەوە ﴿ فێربوونی تووتی﴾یانە دووبارە کردنەوەی کردارێکە بەبێ بەجێ هێشتنی جێماوە لە مێشك و گۆڕانی ڕەوشتی تاك. پێشی دەوترێت فێربوونی ئالی بەبێ ئاگایی.

یاسایەکانی فێربوونی پێوەندیدار بە دەمارگیری. فێربوون لە رێگای کردەبینین (الاستبصار) دەبێت،کردەبینین پرۆسەیەکی هەست کردنی مێشکە بۆ بەیەك بەستنەوەی فاکتەری فێربوون لەگەڵ بزوێنەرەکانی مێشك وەك ئەوەی فێربوو (المتعلم) بە پێی تواناو تەمەنی فێربوو.ماددە کۆدەکاتەوە، دەگەیەنێتە مێشك.

قوتابخانەکانی فێربوون کە پێوەندییان بە دەمارگیرییەوە هەیە ئەمانەن:
١-قوتابخانەی پاڤلۆڤ:کەیاسای مەرجییە واتە بۆ هەموو وەڵامدانەوەیەك لە رەوشتی کەسایەتیی مرۆڤ دەبێت ورووژێنەرێك هەبێت، کە پاڤلۆڤ تاقیکردنەوەکەی لەسەر ئاژەڵ کرد کە (سەگ) بوو هەر کاتێك خواردنی لەبەردەم دادەنا زەنگی لێ دەدا، ئەو زەنگە ببوە هێمای ئاگادارکردنەوەی سەگەکە و وای دەزانی خواردن و زەنگ تەواوکەری یەکترن،بۆیە یەکسەر لیك بەدەمیدا دەهاتە خوارەوە کارلێکی کیمیایی گەدەی دەگۆڕارەوشتی سەگەکە لە کردارێکەوە دەستی بە گۆڕان کرد، واتە زەنگەکە رەمزی کۆکردنەوەی فاکتەرەکانی گۆڕان بوو لە تاکی سەگدا:

وروژاندنی سروشتی+ وروژاندنی مەرجی ⟵ وەڵام دانەوە ( خواردن+زەنگ ⟵ لیك رژان)

٢ قوتابخانەی سورندایك (نزیك بوونەوەی پەرچەکرداری مەرجی) ( یان یاسای شوێن). سپورندایك) تاقیکردنەوەی لەسەر مەیموون کرد. مەیموونێکی خستە ناو سەندووقێکی داخراو لەسەری سەندووقەکە هێشوێکی مۆزی دانابوو، مەیموونەکە دەستی نەدەگەیشتێ و لە ناوەڕاستی سندووقەکە قولاپ هەبوو ئەگەر دەستی پێ کەوتبا ئەوا مۆزەکە دەکەوتە خوارەوە. مەیموونەکە چەند جارێك هەوڵیدا نەگەیشتە ئامانج،بەڵام بەرێکەوت دەستی بە قولاپەکە کەوت یەکسەر مۆزەکان هاتنە خوارەوە.لێرەدا مەیموونەکە بۆی دەرکەوت کە پێوەندی هەیە لە نێوان مۆزەکەو قولاپەکەو هەوڵیدا بە کۆکردنەوەی درك پێ کردنی ئەم شوێنانە توانی بگاتە ئامانج، بەڵام پاڵنەری سەرەکی هەوڵدانەکە پێویستی فسیۆلۆژیی مەیمونەکە بوو (برسیەتی)و لە رووی فیزیکی و وەرزشییەوە هەرچەندە هەوڵدان زۆر بێت هەڵەکردن کەمتر دەبێت و ئەنجامی فێربوون باش دەبێت ئەمەش باشترین بیردۆزی شوشتنەوەی مێشك بوو لەگەڵ گۆڕینی ئاراستەی باوەڕ، بەڵام لە رووی پەروەردەییەوە بەمانای ئارەزووی تاك بەرەو دووبارە کردنەوەی ئەو رەوشتەی هۆی



سەرکەوتن بووە.یان هۆی ئارامگیریی خود بووە لەگەڵ حەزی دوورکەوتنەوە لەو رەوشتانەی کە دەبنە هۆی سەرنەکەوتن و ئازاری دەروونی ئەم تێگەیشتنەی (سورندایك) پێوەندی بە میانەی نێوان سەرکەوتن و خەڵات کردنەوە هەیە. لەنێوان سەرنەکەوتن و سزاو یاسای شوێنەوار یەکێکە لە سێ یاسا سەرەکییەکانی فێربوون لای (سورندایك) کە دەڵێت: هاوبەندکردن بەتین کردن و لاوازکردنی پێوەندییە رەوشتییەکان بەکارتێکەرەوە پێوەندە، یاسای مەشق کردنیش پتەوکردنی پێوەندییەکانە بە مەشق کردن. یاسای بەکارهێنان لاوازکردنی پێوەندییەکانە یان لە بیرچوون، یاسای وازهێنان دابڕانە لە مەشق کردن، یاسای ئامادەبوون هەزم کردنی پێوەندی مەشق کردنە. کە پورندایك لە ماوەی تاقیکردنەوەکەیدا تێبینی کرد.
٣-قوتابخانەی سکنەر (یاسای پتەوکردن) کە ئەمەش لای سایکۆلۆژستی ئەمەریکی (سکنەر)ەوە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا بەکارهات. تاقیکردنەوەی لەسەر ((کۆتر)) بوو کە پێوەندی نێوان گڵۆپی سوورو خواردن بوو دووای ئەوە بۆ تەقاندنەوەی لوغمی کەسی بەکارهات،واتە کۆترەکە هەرکاتێك گڵۆپی سووری دەبینی یەکسەر دەنووکی لێ دەدا وای دەزانی دەنکە گەنمە. کە ئەمەش بووە یاسایەك (جەنەراڵ فرانکۆ) لەسەر ئەم یاسایە سوپایەکی لە (بەکرێ گیراو) دروست کردو ئاراستەی شۆڤینی بەرامبەر رزگاری خوازەکانی ئیسپانیا دروست کرد، بەڵام لایانی پەروەردەیی (سکنەر) ئەو زەمەنە وەسف دەکات کەوا تاك دڵخۆش دەبێت یان بێزار دەبێت لە فێربوون کە ئەمەش خاڵێکی لاوازی یاسای ((سکنەر)) بوو لەگەڵ ((پورندایك)) کە دەمانگەیەنێتە سێ ئەگەرەکەی کاری مێشك:
١ئەگەر پرۆسەی کاری دەماغ ئامادەبوو بۆ کارکردن ئەوا تاك دەگاتە ئۆقرە گرتن.
٢-ئەگەر پرۆسەی کاری دەماغ ئامادەبوو بۆ کارکردن و کاری نەکرد ئەوا دەبێتە نا ئۆقرە گرتن.
٣ئەگەر پرۆسەی کاری دەماغ ئامادەنەبوو بۆ کارکردن ئەوا دەبێتە لە بیرچوونەوەو پەژارەی بەردەوام.

# کاریگەریی فێربوون لەسەر دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی

زۆربەی رژێمە کۆنەکان لە کاوێژی دەماگیریدا سیاسەتی گۆشەگیرییان دژ بەگەلانی ژێردەستە بەکارهێناوەو،لە هەموو سیاسەتەکانیاندا وایان کردووە تاك لە دوو لایانەوە گۆشەگیر بێت.. یەکەمیان: لە جیهانی دەرەوەو رەوتی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیاو رۆشەنبیریی سەروەری مرۆڤایەتی و داهێنانی عەقڵییەتی جیهان و رەوتی مەعریفی دابڕێت و کەسایەتییەکەی داخراو بێت ئەمەش یەکێکە لە دەمارگیریی بەرنامەدار.

دووەمیان:لێك ترازانی ریزەکانی تاك لەگەڵ کۆمەڵ دروست کردنی توێژی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤی هەڵچوو رکابەری بەرامبەر یەکترو لێك دوور کەوتنەوەی توێژەکانی کۆمەڵ و پەیدا کردنی جیاوازیی لە نێوان ناوچەکان (ناوچەگەری) و سەرهەڵدانی خودی کاریزما و فەرزکردنی یەکێکیان بەسەر ئەوەی ترداو قەدەغەکردنی ئازادیی رادەربڕین بە مەبەستی پێشێل کردنی سەروەرییەکانی خاك و گەل.ئەمەش بەپێی سایکۆلۆژستەکانی ئەزموونگەری کاریگەریی دابەزینی تێکەڵ بوونی تاکەکانی کۆمەڵ و کارتێکردنی توێژەکانی کۆمەڵ کاردەکاتە سەر خێرایی فێربوون و بەهێز بوونی مێشك واتە ئەو کەسانەی کە کەمتر تێکەڵ دەبن و هەمیشە گۆشەگیر دەبن وا دەرکەوتووە کە زۆر بەهێواشی فێردەبن و مێشکیان کەمتر شتەگۆڕاوەکان وەردەگرێت و تێبینی کەمترە. کەسایەتی مرۆڤیش لە هەر کۆمەڵگایەکدا زادەی کارلێکردنی کۆمەڵایەتییە و رەوشتی ئەم کارلێکردنەیە گرینگترین رەوشتی و جوولانەوەی تایبەتمەندیی مرۆڤ دەبێت لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا و لە نێوان هەموو تاکەکانی مرۆڤدا شێوەیەکی تایبەتی هەبێت. ئەم پێوەندییەش لەسەر ئەوە دەوەستێت ئەو کردارانەی کە تاك دەیکات و کۆمەڵ وەڵامی کردارەکان دەداتەوە جۆرێك لە رەوشتی تاك و ئارەزوو بەدیار دەکەوێت و دابەزینی ئاستی کارلێك کردنی گرووپەکانی کۆمەڵ گەلێك جار هۆکاری نەریتی





دروست دەکات. ئەمەش لەسەر ئەو کۆمەڵگا بچووکانە جێبەجێ دەکرێت کە باری سروشت و ژیان و سیاسی و ئابووری وای کردووە گۆشەگیرەکان لە جیهانگیریدا بژین و ژیان لە کۆمەڵێکی پەرتەوازەو لێك هەڵوەشاوەوە کەئاستی مامەڵەی کۆمەڵایەتی تێدا نزمە ئەوکاتە گۆشەگیریی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات.

گۆشەگیری کۆمەڵایەتیش هانی تاك دەدات کە بەرەو خۆپەرستیی رادەبەدەرو لێکترازانی کارلێکی کۆمەڵایەتی دەڕوات کە کۆتاییەکەی بە نەخۆشیی عەقڵی کۆتایی دێت، یان هیستریای کۆمەڵایەتی.زۆر لەو پێوەرانەش ئەوەیان سەلماندووە کە لەناو گەلە کراوەکان و چەندێکی تێکەڵاودا، تاکی ئەو کۆمەڵایەتییە چالاکیی فرە لایەنی دەبێت لەناو کۆمەڵدا داهێنانی بەرز دەبێت و هەموو کاتێك لە تاکڕەوی و تەنیایی خودی خۆی دەپارێزێت و حەز لە یاری و گاڵتەوگەپی گرووپی واتە دەستەیی دەکات کە دەبێتە هۆی بەهێز کردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کەم کردنی تاگیریی دەمارگیری وەك بەشداری کردن لە رێکخراوەکان چ سیاسی یان مرۆڤایەتی یان بەشداربوون لە یانەی وەرزشی و دیموکراسی و چالاکیی هونەری و زانستی کە ئەمەش لەو کۆمەڵانە دەبێت کە پیادەی دیموکراسی و یاسای مرۆڤایەتی پەیڕەو دەکەن، بوارێکی دەروونیی فراون و زیندوو لە تاکدا دروست دەبێت بۆ ئەمەش دەروونزانەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو گەلەی شەڕی ناوخۆی زۆرەو لێك ترازان و جیاکردنەوەو ناوچەگەری هەیە منداڵەکانیان بە تایبەتی منداڵە بێ باوك و دایکەکان لە سۆزو خۆشەویستی و باوەشی گەرمی دایك و باوك بێ بەشن پێوەندییان لەگەڵ گۆڕانەکانی دەوروبەردا کەمترەو چالاکیی کۆمەڵایەتی و لەیاریی بە کۆمەڵدا سست دەبن و زیاتر یاری دوژمنکارییان لێ دروست دەبێت وئارەزووی دەکەن لە یاساو داب و نەریتی کۆمەڵ هەڵگەڕێنەوە.

لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا کە (دایموند، کریش، روزندیك) کردیان بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە جیاوازیی دەوروبەر لەسەر پێکهاتەی کیمیاوی مێشك چییە؟!. بۆ ئەم مەبەستە دوو کۆمەڵە مشکی سپییان هێنا کۆمەڵەی یەکەم بریتیی بوو لە چەند

مشكێك بەیەكەوە لە ژوورێكدا بوون و هۆیەكانی ژیان و حەوانەوەی تێدا زۆر بوو. كۆمەڵەی دووەمیش یەك مشك بەتەنیا لە ژوورێكدا بوو بەهەمان شێوەی یەكەم ژوورەكە هۆیەكانی ژیانی تێدابوو دوای تەواو بوونی كاتی دیاری كراو بینرا مشكەكانی كۆمەڵەی یەكەم:توێكڵی مێشكیان ئەستوور ترو توندترە لە كۆمەڵەی دووەم،هەروەها ئەوانەی كۆمەڵەی یەكەم چالاكیی كۆمەڵایەتی و پێوەندیی نێوانیان و چالاكیی تاكییان زیاترە لە كۆمەڵیی دووەم كە خاو و گۆشەگیرەو چالاكیی تاكی سستەو كەم تێبینی گۆڕاوەكانی دەوروبەر دەكەن. ئەم دراسە كردنە بووە بەرنامەی دەستەڵاتە سەربازییەكان دژ بە گەلان و كەسایەتیی سیاسی بەكاریان دەهێنا هەر لە ژووری تەنیایی و جیاكردنەوەیان لە هەستی دەوروبەرو دوور خستنەوەیان لە هۆیەكانی پێوەندی كردنی كۆمەڵایەتی و چالاكییەكانی و ملكەچ كردنیان بۆ یاساكانی ئەوان بۆ گۆڕینی ئاراستەو زیادكردنی تاوگیری دەمارگیری.لەهەمان كاتدا ئەم كەسانە دەخرانە ئەو ژوورانەوە كە پیاو خەراپ و لاسار و لادەریان لێیە بۆ كارتێكردن و گۆڕینەوەی رەوشتی وەرگیراوی كاتی بە پێی بیردۆزی پاڤلۆڤ.بۆ ئەوەی بیر لە چالاكیی ئازادیی فیكری و كۆمەڵ نەكەنەوە.

هەمان لێكۆڵینەوە بەرامبەر گەلە بچووكەكان بەكاردەهێنرا و جیاكردنەوەی لە هۆیەكانی پێوەندی كردن و تێكەڵاو بوون و پچڕانیان لە پێوەندی ئابووری و رۆشەنبیری تا وایان لێ دەكرا هەر بە گۆشەگیری بمێنێتەوە. واتا تێكەڵاو بوون و گۆڕینەوەی رەوشتەكاتیەكان دەبێتە هۆی خێرایی فێربوون و بەهێزبوونی تێبینی كردن و وەرگرتنی رەوشتێكی كۆمەڵایەتی و سڕینەوەی دەمارگیری و دابەزینی تاوگیری هەڵچوون و رق و كینە بەرامبەر فاكتەرە شاراوەكانی مێشك. گرینگترین هۆكاری لاواز بوونی دەمارگیری و نەمانیش تێكەڵاوبوونە.

ئەمەش لێكۆڵینەوەیەكی سایكۆلۆژی- كۆمەڵایەتی بوو (سایكۆ- سۆسیۆلۆژی) كە باس لە پێوەندی و گۆڕینەوەی كلتوورو شارستانییەت و رۆشنبیری نێوان گەلان دەكات بۆ دروست كردنی كەسایەتییەكی بەرجەستەكراو و ئەو گەلانەی ئەم مامەڵە





شارستانییە یان شارستانیان كردووە بوونەتە پێشەنگی دەوڵەت و پێشكەوتن و زانست،بەڵام ئەو گەلانەی لە مێژوودا ئەم پرۆسەیان ئەنجام نەداوە لە پێشەنگی دیالێكتیكی مێژوویی دابڕاون،گۆشەگیر ماونەتەوەو هەمیشە بیریان لە تۆڵە سەندنەوەو رق و كینەو تاك پەرستی كردۆتەوە.

كەلتووری نەتەوایەتی هەر گەلێك ئاڵوگۆڕی لەگەڵ گەلانی تر نەبێت ئەوا ئاستی بیركردنەوەو پێشكەوتنی زانستی دادەبەزێت و لەرەوتی پێشكەوتنی جیهانگیری دادەبڕێت و زیاتر سیفاتی خۆپەرستی و تاكڕەوی بەزەقی دیار دەبێت و جێگای بەرنامەی رۆژانەی خەڵك دەگرێتەوەو كۆتاییەكەی بەسەنگەر لێك گرتن دێت.

راڤە كردنی ئەم بابەتە بۆ گەشەكردنی كەسایەتیی تاك لەناو كۆمەڵداو بەرز بوونەوەی ئاستی تێگەیشتنی جەدەلیی راستیەكانی دەوروبەری تاك لەنێو كۆمەڵدا كارلێكی كۆمەڵایەتیی گرنگی هەیە. دەشبێتە زیاد بوونی وەڵامدانەوەی كارە وروژێنەرەكانی نێو خودی كۆمەڵ لەگەڵ رەوتی پێشكەوتنی كۆمەڵانی تری جیهان. ئەم كارلێكە كۆمەڵایەتییە لەنێو هەندێك گەلانیشدا كە بە گەلانی داخراو ناونراون كەم دەبێتەوە جا چ بەهۆی باری جوگرافی وەك ئاو و دەریا و شاخ و شوێنی سەختەوە بێت یا بەهۆی سیستەمی كۆمەڵایەتی و سیاسی...

كەوا ئاستی ئاڵوگۆڕی كلتووری لە ئاستی سیستەمی دیموكراسی جیهاندا رەفتار بكات. واتە چەند رەهەندێك هەن كەوا رێگری ئاڵوگۆڕی شارستانییەتن.

١گۆشەگیری بەهۆی دیمۆگرافیا و سیستەمی سیاسی و كۆمەڵایەتی.

٢نەگونجانی توێژەكانی كۆمەڵ و چینە لێك پەرتەوازەكانیان.

٣گیانی كۆنەپارێزی و كاریزما دروست كردن، ئەمەش ئەو هۆزانە (تیرە) دەگرێتەوە كە توێژی كۆنن، بەهۆی كوودەتای كۆمەڵایەتی و پێشكەوتنی ترسی ئەوەیان دەبێت كە پلەوپایە لەدەست بدەن جا بە هەموو رێگایەك پارێزگاری لە سیستەمی كۆن دەكەن و دژی گۆڕانی كۆمەڵ و سیستەمی ئابووری دەوەستن.

ئەمانی گیانی داهێنان و نوێکاری لەلایەن تاکی کۆمەڵەوە کە لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵ گەورەترین تەگەرەیە ئەمەش بەهۆی نەبوونی پرۆسەی تێك هەڵکشانی شارستانییەت و کلتووری نەتەوایەتی و ملکەچبوون بۆ یاسایەکی دکتاتۆرانە کە گەل هیچ مافێکی بیرکردنەوەی نییە بۆ گۆڕینی دەستوور.

واتە پەرەپێدانی رەهەندی کەسی کاریزما کە هیچ کاتێك زەمەن بۆ بڕیارو دەستوور دانانێت و هەموو کاتێك لەسەر پێوەندی کۆمەڵایەتی خۆی رادەوەستێت و بنکەی کۆمەڵایەتیی خۆی دروست دەکاتەوەو دژ بە ریفراندۆمی گشتییە. لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا پێوەندیی کۆمەڵایەتی و ئاراستەی دەمارگیری بە پێی پێوەندی بەرهەم هێنان دەگۆڕێت لەم کاتەدا ئەم پێوەندییە دەبێتە دەرسی دروست بوونی ئاراستەی کۆمەڵایەتی کە هەموو هۆیەکانی فێر بوون و راگەیاندن و بەرهەم هێنان لەبەرژەوەندیی خودی چینێکی دەستەلاٌتدار بێت و ببێتە دروست بوونی رووکاری نێگەتیف بەرامبەر چینەکەی تردا دەکات کەوا هەست بکەن لەرەگەزەوە جیاوازن نەك بەهۆی پێوەندییە ئابووریەکان و کۆمەڵ کە بەپێی لێکدانەوەی کارلێکی خۆیان کە هەموو سەرچاوەیەکی جیاوازی مرۆڤایەتی لەسەر بنەڕەتی رەنگ و رەگەزو نەتەوە لێك دەدەنەوە. بەلاٌم دەمارگیری خۆی لەخۆیدا لە تەنگژەی ئابووری و نایەکسانیی کۆمەڵایەتی و ئابووری دروست دەبێت و سەرهەڵدانی ئەم جیاوازییەش لە دوو فاکتەری سەرەکیدا بەدیار کەوت، لێك جیابوونەوەی چینەکان بووە،ئەوکاتە نەتەوەو مەزهەب و رەنگی پێست لە شێوەی تازەی دەمارگیریدا سەری هەڵدا واتا لەگەڵ سەرهەڵدانی سادەترین تەکنەلۆژیادا گشت کاتێکیش دەمارگیری (رشیالیزم)بۆتە بنەڕەتێکی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی رەنگ دانەوەی ئەو بارە ئابوورییە. لەسەدەی ئێستاشماندا زۆر لەهۆیەکانی دەمارگیری گۆڕاوەو ئەدەبیاتی تازە بۆ رتووشکردنی پرسی دیموکراسی و مافی مرۆڤ هاتۆتە کایەوە. بە پێی لێکدانەوەی سایکۆلۆژستەکان ئەوەی بارگە ئەکتیڤی بەرامبەر دیموکراسی هەڵگرێت ئەوا هەمیشە فاکتەرێکی چالاك و پێشکەوتوو و کۆمەڵایەتی دەبێت و کاریگەریی





دەمارگیری و شۆڤینی لەسەری کەم دەبێت و بارێکی دەروونی هاوسەنگ دەبێت و لەرووی فسیۆلۆژییەوە ئەو نەخۆشییانە ناگرێتەوە کە سیفەتی سادیزمی تێدا بێت و پشت بە ئاگادار کەرەوەکان نابەستێت و تەمەن درێژو چوست وچالاك دەبێت، توانای وەرگرتنی مێشك زیاتر دەبێت و هێزی تێبینی چاکتر دەبێت بە پێچەوانەی ئەوکەسەی کەوا بارگەی نەگەتیڤیان هەڵگرتووە دەمارگیری نەتەوایەتی چەند فاکتەرێکی رووکاری هەیە یەکێك لەوانە فاکتەری مەعریفی، بۆ نموونە کەسێك چوو بۆ ناو گرووپێکی سیاسی کە لە گرووپێکی تر بە چاکتری دەزانێت بێ ئەوەی رەوتی فەلسەفەی ئەم گرووپە لێك بداتەوە، یاخود زۆر چینە هەژارەکان بەهۆی نەبوونی باری ئابووری و نەبوونی هۆشیاریی چینایەتییان پەلکێشی گرووپە راستڕەوە ئوسوولییەکان دەکرێن بەلاٌم ئەو کەسەی کەوا دەچێتە نێو ئەو گرووپەی کەوا لەگەڵ مەیل و ئاکارو بیرو بۆچوونی دەگونجێت ئەوا بەشداری لە دروست بوون و بەرەو پێش چوونی دەکات. ئەو کەسەش فاکتەری مەعریفی لا بەهێزە. بەلاٌم فاکتەری تری دەمارگیری باری هەڵچوونە کە تاك بەهۆی رووداوێکەوە لەکات و شوێنێك یان بەهۆی هەڵسوکەوتی نوێنەری گرووپ بەبێ لێك دانەوەو قووڵبوونەوە لە هێڵی فەلسەفی و ئامانجی ئەو گرووپە، یەکسەر ئەو گرووپە دەبوغزێنێت و دژایەتی بێ دەنگی دەکات، یاخود بە پێچەوانەوە بەهۆی چاکەو هۆشمەندیی ئەندامێکەوە و کارێکی چاکی ئەو گرووپە لەو شوێن و کاتەدا دەبێتە سەرنجڕاکێشانی و ئەو پڕوپاگەندەی بۆ دەکات و هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازێت.

ئەم دوو جۆرەی ئینتمای گرووپە حاڵەتی نێگەتیفی سلبی لە عەقڵی مەعریفی ئەو کەسە دروست دەکات و لەرووی دەروونزانییەوە ئۆمەنستانە بیر دەکاتەوە (سۆزو هەڵچوون) بۆیە دەبێت ئەو گرووپانە لە رووی (سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی و ئەرکیۆلۆژی)یەوە هەڵبسەنگێندرێن. ئەم گرووپە سەرکەوتن بەدەست دەهێنن یان زۆر جار دەبینین هەندێك گرووپ لە هەندێك ناوچەی جوگرافیدا خۆشەویست نییە تەنیا لەبەر هەڵسوکەوتی ئەو هەڵسوڕاوانەی کەلەوێن. فاکتەرێکی تر وەك

(مکوایر)دەست نیشانی دەکات ئاراستەی فرمانی دەربڕینە کەیارمەتیی گەشەی تاك دەدات مەیل و ئاراستەی بەهێز دەبێت بۆ ئەوەی توانای زاڵبوونی بەسەر هەموو گۆڕاوەکانی ئاراستەکاندا (الاتجاهات) هەبێت ئەکتیڤانە لەگەڵ دەوروبەر مامەڵە بکات هەردەم کەسایەتێکی سەرکەوتوو دەبێت.

فاکتەری چوارەم،بریتییە لە کارۆلۆژیی دەماغ لەسەر خود وەك ئەوەی هەژاری سپی پێستەکانی ئەمریکا هەست بەکەمی ناکات چونکە لە ئەمریکا لەو خراپتر هەیە کە رەگەز پەرستی بەرامبەر بەکاردێت ئەویش هەژاری رەش پێستە.

سەرجەمی ئەو چوار فاکتەرە ئەوە دەگەیەنێت کەوا هەڕەشە کردن بۆ سەر خود یان ترساندنی کەسایەتیی مرۆڤ و کەرامەتی دەبێتە هۆی گۆڕانی بیروباوەڕ و ئاراستە کردنی بەرەو رووی کەم کردنەوەی هەڕەشەکردن. دڕندەیی و توندوتیژیی سیستەمی سەربازی هۆی سەرچاوەی هەڕەشە ترسان و تۆقاندن و گرێ کوێرەی دەمارگیریی نەتەوایەتین کەوایان کردووە تاك هەموو مەیل و ئاراستەی خودی باوەڕ پێکراو بشارێتەوە و تووشی چەپاندنی فکری ببێت و (بەرزەمنەکانی) دەشارێتەوەو تووشی نامۆیی دەبێت. لەرووی سایکۆلۆژییەوە ترس و هەڕەشە کردن دوو پرۆسەی دینامیکی بەردەوامن بۆ شێواندنی باری دەروونیی تاك و نامۆ بوونی خود، بەلاّم ئەوە نابێتە گۆڕانی رەوشتی مرۆڤ، چونکە گۆڕانی ئاراستەو (مەیل)ی تاك حاڵەتێکی کاتییە واتا هەرچەند توندو تیژیی بەردەوام بێت بەرامبەر گەلان و تاکی کۆمەڵ ئەوا گیانی هەڵگەرانەوەو تێکدانیدەستووری دروستکراو بەردەوام دەبێت، کە بەپێی هەرەمی پێویسەکانی (ئەبراهام ماسلۆ) (چوونە ناو کۆمەڵ) دەگرێتەوە، واتە رەوشتی تاك هەرگیز ناگۆڕێت وەك کەسێك جگەرەکێش بێت ئیدمانی کردبێت دەتوانێت بەهۆی هەڕەشەو ترس یان هەر سەرچاوەیەکی دەرەکی بۆ ماوەیەك وازی لێ بهێنێت،بەلاّم هەر کاتێك ئەم هەڕەشە کرنە نەما ئەوا دووبارەی دەکاتەوە. ئەگەر هەڕەشەکردن و تاوگیریی دەمارگیری لە سنوور دەربچێت و بەرگری خودی





تاکی بەزاند ئەوا تاك ناچار دەبێت بۆ دەرباز بوون لەو هەڕەشەیە رێگا چارەیەك بدۆزێتەوە ئەویش هەڵگەرانەوەو خەباتی چەکدارییە. دروست کردنی دژە سەنگەر. رەهەندەکانی دەمارگیری بەپێی هۆشمەندی و زیرەکیی تاك دەگۆڕێت ئەو کەسانەی یان گەلانەی سادەو ساویلکەن بەزەمەنێکی کورت دەخزێنە ناو بواری دەمارگیری و بەئاسانی دەبنە زەمینە خۆشکەری ئاراستەی نێگەتیڤ، بەلاّم ئەو کەسانەی هۆشمەند و هوشیاری نەتەوەییان هەیە زۆر بە زەحمەت فاکتەرەکانی دەمارگیری (رشیالیزم) زەفەریان پێی دەبات.

ترس و هەڕەشە کەمتر کاریان لێ دەکات و پێوەندییەکی پتەوی کۆمەلاّیەتییان لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵی تردا هەیە. سایکۆلۆژستەکانی ئەزموونگەری (ئەدلەرو پاڤلۆڤ)دەڵێن مرۆڤی ناهۆشیار هەمیشە بەناوی سۆزو هەڵچوونەوە کاری تێ دەکرێت،بەلاّم مرۆڤی هۆشیار زیاتر بەناوی هەڕەشەی خود و مەنتیق کاری تێ دەکرێتواتە دەمارگیری پرۆسەیەکی پەروەردەییە لە ماڵەوەداو بە فاکتەری دایك و باوك سەرهەڵدەدات. واتە دژایەتی لە ژیانی تاکداو گرێی ((لبیدو)) لە مندالاّن و گۆڕانکاریی ئەم دواییە و سیستەمی جیهانگیری بەشێوەیەکی تێڕامان لە هزری رۆشنبیرەکان لێك دراوەتەوە گۆڕانکارییەکی نێگەتیڤی لەسەر خود دروست کردووە بۆیە خەڵکان تووشی داتەپینی کەسایەتی هاتوون و تێرنەکردنی پێویستییە سەرەکییەکانی نەتەوایەتی و شوشتنەوەی مێشك و دروست کردنی دژە ئاراستە و ئارەزووی خەفە کراو لە عەقڵی سیاسیدا هەمیشە بەرنامەیەکی تۆکمەی دەمارگیری بووە.روست کردنی رووکاری نادروست لە مێشکی مندالاّندا و زاڵبوونی فەلسەفەی رەگەز پەرستی و دڕندایەتیی لە نێوانیاندا تەنانەت بە ئاشکرا لە ئەدەبی مندالاّندا دیار بوو و بۆ ئەم ئاراستەیە کاریان دەکرد نموونە، جۆری فیلمی کارتۆن کە چۆن بە ئاشکرا ئەم جۆرە فیلمانەدەبوونە هۆی وروژاندنی هەستی کەسایەتیی دەمارگیریی تاك و ئەمهەستەی دەخستە بەرچاوی مندالاّن بەتایبەتی لەنێوان رەش و سپی پێستەکاندا وەك لەو فیلمانەی کە چەندان جار دووبارە بوونەتەوە، سەرەتای

فیلمەکان بەوە دەستی پێ دەکرد کەوا دوو هێلکە وەك یەك لەرەنگ و قەبارەدا، دوای تـرووکانی یەکێك لە هێلکەکان جووجەڵەیەکی سپی جوانـی لێ دەردەچوو چوست و چالاك هەڵبەز و دابەزی دەکرد و گۆرانـی دەووت، کەچی دوای تێپەڕ بوونـی چەند ساتێك ئینجا زۆر بەزەحمەت هێلکەکەی تر دەتروکا و جووجەڵەیەکی تووك رەشی لێ دەردەچوو کە قەپێلکی هێلکەکە هەر بەسەریەوە بوو و لاوازو بێ توانا بوو نەشی دەزانی بڕوات و سەما بکات، بەلاّم جووجەڵە سپییەکە هەردەم دەجوولاّیەوەو سەمای دەکرد وگاڵتەی بەوەکەی تر دەکرد. چەندەها بەرنامەی دارێژراوی لەو بابەتە دەخرایە نێو راگەیاندنی مەبەستدار کەدەبووە هۆی دروست بوونی رق و کینە و ئاراستەی نێگەتیف بەرامبەر نەژادی جیاوز لە رەنگ و نەتەوەدا کە دەبووە هۆی سەرهەڵدانی سایکۆلۆژییەتی دڕندایەتی بەرامبەر کە حەز نەکات ئەمیان بێت و حەز بکات ئەوەی تریان بێت کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دوو خودی دژ بەیەك لە دەروونی مرۆڤدا دروست دەکات هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات کە گێژاوێك دروست بکات و ئەوە بخاتە هزری کۆمەڵەوە کە دوو شتی دژ بەیەك دروست بوون و دوو مرۆڤی جیا لەیەك لەسەر زەوی هەن ئەمیش خۆی لەخۆیدا دەمارگیری دەگەیەنێت.



## سەرچاوەکان




١-سمير نعيم غنيم. دراسات تجريبية للاستخدام الاختبارات الادراكية في تميز الاكلينيكي.كلية الاداب، جامعة عين الشمس، ١٩٦٣.

٢-لويس كامل ملكية. قراءات في علم النفس الاجتماعي في البلاد العربية. الدار القومية للطباعة و النشر ١٩٦٥.

٣-صلاح نصر، الحرب النفسية (معركة الكلمة و المعتقد)، القاهرة، ط الثانية ١٩٦٧.

٤-سيد محمد الغول. سيكولوجية الشخصية، دار النهضة العربية ١٩٧٣.

٥-دمام الكيال. دراسات في علم النفس. مكتبة الشرق الجديد، بغداد ١٩٧٧.

٦-تريظوز، علم النفس التربي. ترجمة،موفق الحمداني و حمد الكربولي. مطبعة بغداد، بغداد ١٩٧٩.

٧-فاضل الايزر جاوي،أ ثر الاعلام في العنف و التعصب، جامعة الموصل كلية التربية، محاظرات ١٩٨٢.

٨-محمد ياسين وهيب، علاقة التربية بالتميز العنصري، أطروحة الماجستير، جامعة الموصل ١٩٨٣.


# دەرونزانی بونیادگەری‌و سیستەمی نوێی جیهان

((فرانسیس فۆکۆیاما))لە کۆتایی مێژوودا دەڵێت، تاکی کۆمەڵ بەوو ڕادەی کە دەکات گوناحبارە، بەهەمان شێوە هەست دەکات کەوا بێ تاوانە، چونکە لە لێکدانەوەی دەروونی،تاك هەمیشە دەیەوێ یەك پێوانە بۆ خودو بابەت دابڕێژێ،

لە یەك سۆنگەی فكری كۆیان بكاتەوە كەوا هەردووكیان تەواوكەری یەكترین، هاوبەشن لە بوونی مرۆڤ،چونكە تاك كاتێك هەست بەنەخۆشی دەروونی دەكات، بوونیان نەبێت تەنیا لە چەند لێك دانەوەیەكی خودیانەیە بۆ گونجان لەگەڵ دەوروبەردا بەهەمان شێوە دەتوانێت بە گونجانو هاوسەنگ بوون خۆی لەبەرامبەر نەخۆشییە دەروونیەكان ڕابگرێت.

ئەمەش بەشێكە لە تێگەیشتنی بوونی مرۆڤ وەك ئۆمەنستانە بیر لە كێشەكانی خۆی بكاتەوە، چونكە هەموو شتەكانو ململانێی ئایدۆلۆژییەت لە بوونی مرۆڤەوە دەست پێ دەكات،كێشە لەسەر بوونی مرۆڤ نییە، بەڵكو لەڕووی دەروونزانییەوە كێشەكە زیاتر لە بەهەبوونی مرۆڤە واتە كۆتایی ئایدیۆلۆژییەت بە كۆتایی مێژووەوە نەبەستراوەتەوە، مێژوو بوونی ململانێ خودیەكانی مرۆڤ دەسەلمێنێ لەگەڵ هەموو بوونەكانی تر،چونكە كۆتایی ئایدیۆلۆژییەت واتە كۆتایی سەدەیەك ململانێی مرۆڤو دەست پێكردنی سەدەیەكی تر، مرۆڤ لەسەردەمی تەكنەلۆژیا بەپێی دەروونزانی بووندگەری ئایدیۆلۆژییای كۆمەڵ نەماوە، بەرەو ئایدیۆلۆژییای تاك دەستی پێكردووە زیلتر ئایدیۆلۆژییەت لە بوونی تاك خۆی دەنووێنێو بۆتە كارێكی تایبەتیو زهنی هەموو ئایدیا_ پەرلەمانییەكان بەرامبەر شاشەكانی مۆنیتێر هەرەس دێنێ واتە خۆ خووی ئایدیۆلۆژیا.

دەروونزانی بونیادگەری لە سیستەمی نوێی جیهاندا جەخت لەسەر گەڕان بۆ خوودی تاك دەكات، كەهەموو پرینسیپەكان لەڕەخنەی خودەوە دەست پێدەكاتو لە یەكترگەیشتن زیاتر بەهۆی زمانی تایبەتییەوە دەبێت، نەك بەهۆی ئایدیۆلۆژییا سنووربەندمان دەكات، لێكمان جیا دەكاتەوە،ئەوە لە سیستەمی نوێی جیهان تاك بە تاكێی ترەوە دەبەستێتەوە ئەبستمۆلۆژییای زمانو ئاخاوتنە واتە تێگەیشتن لە خود تەكنیكی چارەسەری نەخۆشی دەروونیەكانە. دەروونزان ( جاك لاكان) ئەوە دەردەخات كە ئەبستمۆلۆژییای هەر نووسینێك دەبێت لە نائاگاوە بێت واتە نووسین باوەڕ بوونە بە ناوەڕۆكی بابەت هاوتەریب نەك نووسین بۆ چێژێكی هەستی دەبێت





لە ئاستی مەعریفی خوێندنەوە لە نائاگایی نووسین دەربخەینو بابەتەكان مەنگەنە بكەین،چاكترین فاكتەری هزری نووسین جەدەل دروست كردنە یاخود پەلكێشكردن بۆ زانینی خوێندنەوەی سەرەتا لە تێكست.

(لاكان) لە كایەیی نائاگاوە گێڕاوەی مێژوو دەست پێ دەكات، بەڵگەش هزری ئایینی (تەوتەمییەكان) بووە لە چۆنیەتی دروست بوونی یەكەم دەستەلاتی نادیارو فیكتەری سانسۆری ویژدانونامۆ بوون سەرهەڵدەدات لە (تەوتەمو تابۆسەكان)، بۆیە (( جان بیاجیە))دەڵێت بونیادگەری شێوەیەكە لە ڕێگای شیكردنەوەی مەعریفە دوور لە پرنسیپی باوەڕ، ئەگەر لە ڕێگای باوەڕەوە بووە، ئەوا چەند باوەڕێكی هەمەلایەنەو فراوان دەبێت،چونكە مرۆڤ بەرامبەر زانستو سیستەمی نوێی جیهان ناتوانێت شاراوەبێت كەوا زانست دەتوانێ چاودێری لێدانی دڵو هەناسە بكات جۆری بیر كردنەوەو خەونەكان بزانێت لە نائاگاوە ئاگاداری دەربكاتو ڕەوشی شاقوڵیو ئاسۆی تاك شیبكاتەوە،واتە مرۆڤ لەبەردەم زانستو پێشكەوتنی دەروونزانی ڕووت كراوەتەوەو بێ هێزە بەرامبەری ئەمەش بە پێی دەروونزانی بونیاگەری سیاسەتی (سیپرناتیك)ی پێ دەڵێن (خودە كۆنترۆڵ) بەمەش مرۆڤ پرۆسێسە خودیەكان وون دەكات تەنیا یەك دووری دەبێت بۆیە (جاك لاكان) دووبارە گەڕایەوە سەر نائاگای فرۆیدو دووبارە كردنەوەی گەشەپێدانی.

یەكەم جار ساڵی(١٩٤٧) (لاكان) كە چیرۆكی (وتار درزاو)ی (ئەدگار ئالان پۆ)ی شیكردەوە باسی خودی گشتی دەكات كە زاڵە بەسەر كەسایەتییەكان؟ بۆتە هێمایەك بۆ هەمووكەسایەتییەكانی تر واتە بەگشتی كردنی خود كە كاریگەری هەبێت بەسەر تاكەكانی كۆمەڵ لە نێوان ئاگاو نائاگا زۆر هەستی تر هەن كە جێگای گفتوگۆو لێكگۆڵینەوەی زانستن كە كێرڤی هزرو ئیدیۆلۆژییا دیاری دەكات. ئەگەر فرۆید دینامێكی نائاگاو ئەو هەڵێنجاوە لە شیكردنەوەی (تاوانی كوشتنی باوك) لە ڕۆمانی ( تاوانو سزا)ی دیستۆیفسكی كە بایەخی تەنیا بە لایەنی لادانی كۆمەلایەتیو توخمی داوەو ڕەنگدانەوەی لە نائاگاو بەرزبوونەوەی بۆ پێش ئاگا

بەهەمان فۆڕمو ناوەڕۆك (جاك لاكان) کەسایەتییە هێمایەکان لە چیڕۆکی (وتاری دزراو) کەهێما دەبێتە هۆی دروست کردنی کەسایەتییەکان لە شاراوەیی دەریان دەخات.واتە بونیاد گەرییەکان دەیانەوێ بەدوای حەز بگەڕێنو میتاحەزەکان هاوتەریبی سیستەمی نوێی جیهان بکەن کە حەز لە ئەنجامی کەمی خودەوەدەبێت تاك هەوڵی پڕکردنەوەو جێگرتنەوەی دەدات حەزیش بە خودیو بابەتی دەبێ پاڵنەر هەبێت لەژێر ناوێك خۆی دەربخات لەسنوری ئەبستمۆلۆژیاوە دەرناچێت، لەوانە بەهۆی ڕێکخەری کۆمەلأیەتیو دابونەریت ئەم حەزە بگۆڕدرێت بە حەزێکی تر، بەلأم دەبێ مەیل بەرامبەر ئەم گۆڕانکارە هەبێت. واتە ئەگەر بونیادگەری هیچ پاسوێك بۆ هەبوونی خۆی دانەنێتو ئەنتی ئایدیۆلۆژیا بەهەڕمێن دەکات کۆتایی مێژووی میتۆدی چینەکان ڕادەگەیەنێت ئەوا دەروونزانی بونیادگەری سەرەتای دایەلۆگی زانستی نائاگا دەبێتو چەندان میتۆدی فکری دروست دەکات لەوانە بێ کۆتایی پەیوەندیو دایەلۆگ لەنێوان ئاگاو نائاگا بدۆزرۆێتەوە. هەموو پڕۆسەیەکی ئەم کایە بەم داهێنانی تاك دەژمێردرێتو ئەوەی بونیادگەری دەروونزانی ژکردیان تەنیا گەڕانەوە بوو بۆ نائاگای (فرۆید)و دەست پێکردنەوەی بە فۆڕمێکی تازەوە لەگەڵ دابەشکردنی پەیوەندی قۆناغەکانی گەشەی کەسایەتیو کاریگەری گرێی (ئۆدیبو ئەلەکترا و لبییدۆ) کە ئەمانە لەسەرەتای تەمەنی منداڵ دەست پێ دەکاتو کۆتایی دێت، بەڵکو بەشێوەیەکی کاتی ئەم قۆناغی گەشەیە گەڕانەوە دەبێت لەسەردەمی دایکایەتی لەو کەسە دووبارە سەر هەڵدەداتەوە. بونیادگەریەکان لە شیکردنەوەی دەروونە چەپاندن بۆ سێ جۆر دابەشی دەکەن داچەپاندنی سەرەکی کە بە هۆی سیستەمی سیاسیو ئابووریو کۆمەلأیەتیو دابونەریت بە شێوەیەکی توندو تیژ بەسەر خواستەکانی تاك فەرز دەکرێو ناچار دەکرێت حەزو بۆچونەکانی بۆ دواوە زەمەنێکی تر هلبگرێت ئەو کاتە توشی هەڵگەڕانەوە دەبێت.

جۆری دووەم:چەپاندنی نەگونجاو واتە ئەو حەزو ئارەزووو مەیلی تاك ناتوانرێت تێر بکرێت بەهۆی سیستەمی خێزانو پەروەردەی چەوتی دایكو باوكو



گۆشەگیرکردنی منداڵەکانیان لەگەڵ دەوروبەرو چاودێری زیاد لە پێویستو ڕەچاو نەکردنی تەمەن واتە منداڵەکەت وەك عەقڵیەتی خۆت سەیر بکرێت، ئەو چەپاندنە تووشی لادانی کۆمەلأیەتی دەکات.

جۆری سێیەم:چەپاندنی گونجاو، واتە ئەو حەزو ئارەزووو خواستانەی خودی خۆت لە هەست کرن بە لێپرسینەوەو ترسی لۆمەکردنو ریزی خەڵکانی تر ئەو حەزانە تووشی داچەپاندن دەبنو لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان ئەمەش بۆ ڕازیکردنی کۆمەڵو ویژدانە دبێتە هۆی زیندە خەون لە تاك کە کۆتایی بە دڵەڕاوکێ دێت کە سایکۆلۆجستەکان دەیکەن بەسێ بەشی جیا لە یەکتر. دڵەڕاوکێ واقعی ئەمەش کاتێ تاك ڕووبەڕووی کێشە کۆمەلأیەتییەکانو ئابووریو سیاسیو فکری دەبێتەوە خۆی دەخاتە بەردەم قەیرانێك کە نەتوانێت بە ئاسانی لێی دەرچێت ئەمەش دوو بەش دەگرێتەوە یەکەم دڵەڕاوکێ لە پێناوی مانەوەو خۆدۆزینەوەو دروست کردنی ڕێزو دەستەلأتی کۆمەلأیەتی.

دوەمیان دڵەڕاوکێی ڕاستەقینە لەناوچوون واتە ترسی لەناوچوونی کیانی خود لە دەستدانی ڕێزو دەستەلأتی کۆمەلأیەتیو مایەپووچی سیاسیو ئابووری. جۆرێکی تر دڵەڕاوکێی دەمارەکییە کە ئەمەش لە ئەنجامی نەخۆشیو لەدەشت دانی ئەندامێکی لەشو هەست بە کەمی کردنو هەست کردن بەوەی کە جێگای لەناو کۆمەڵ نابێتەوە گاڵتەی پێ دەکەن هاوسیەنگی دەروونی تێك دەچی بەرەو دڵەڕاوکێی توندو درێژخایەن دەچێت، بەلأم جۆری سێیەم جۆری دڵەڕاوکێی ئاکاری ئەمەش منی بالأ سەرپەرشتی دەکات کە لە ئەنجامی پەشیمانی کردەوەیەك یان پەرچە کردارێك دێت کۆتایی بە ئازاری دەروونی دێنێت یان دڵە ڕاوکێ بەرامبەر خواوەندو ئلینو کۆمەڵ کە ویژدان تێیدا بەرقەرار دەبێت.

بەلأم (جاك لاكان)دینامێکی کەسایەتی بە پێی بوارەکانی گونجان لەگەڵ سیستەمی جیهان لێك دەداتەوە بۆ: وزەی دەروونی کە وزە خودیەکان دەگرێتەوە وەك (سووڕانی خوێن، ماسولکەو هەستو بیرکردنەوەو بیرهاتنەوەو کۆکردنەوەی

زانیاری)جۆرێکی تر بریتییە لە ڕەمەکییەکانی تاك کە لەگەڵ ئەو بناغەی کەسایەتی دەگونجێنێت سەرچاوەی کێژ وەرگرتنە لە هەموو حەزو ئارەزووەکان، یاخود تێکردنی خواستە فسیۆلۆجیەکانو دەروونیەکانو هزریەکانە ئەمەی دوایی زیاتر لە بواری ناهەستی دەبێت، بەڵام چێژ وەرگرتن دەکەوێتە دواوەی هەستییەوە. ئەمەش لە تاك بە ئاشکرا یان بە نەهێنی ئەو ڕەمەکییە تێر دەکرێت.

بەشێکی رت لە داینەمێکی کەسایەتی بریتییە لە هێزی بەرگریو هێزی بەرپەرچ دانەوە،واتە لە کاتی هێرش کردنە سەر خودی مرۆڤو لە ترسی داتەپین، تاك هێزی بەرگری بەهۆی میکانیکی فێڵی بەرگری دەروونی بەکار دەهێنێت بۆ ئەوەی کیانی خۆی لە لەناوچوون بپارێزێت،بەڵام هێزی بەرپەرچ دانەوە واتە هێرش بردنو ئازاردانی بەرامبەر بۆ ئەوەی کردارەکان دووبارە نەکرێتەوە کەسایەتییەکی زاڵ دروست بکەین هەست بە بەرزبوونەوەی پاڵنەری شاڕانگێزی بکەین. سیستەمی نوێی جیهان واتە تێکشکاندنی ئایدیۆلۆژیای بلۆك بەندیو تێکەڵ بوونی هزرمەند لە نێوان تاكو کۆمکەڵ،واتە جێگرتنەوەی[٩] ئازادی تاكو بەڕەڵاکردنی خواستەکانی تاك لە سنووری یاساییدا ئەمەش سوکگکردنی فشارو فرمانو مل کەچی دەوڵەتو حزبە بەرامبەر تاكو پەیڕەوکردنی ڕکابەری داهێنانو تەکنەلۆژیا بۆ بەرژەوەندی گرووپی...

لە بەرامبەر ئەمەدا دەروونزانی بونیادگەری هەستی بەوە کرد مەیلو بۆچوونو ڕەمەکییەکانی تاك تووشی خەفەقان بوون (لە چاوەڕێی گۆدۆ) دەژین. تاك بەهۆی هەندێ یاسای سایکۆلۆژیو فسیۆلۆژیو ئەنترۆپۆلۆژی بلۆك بەند کراوە، ڕەوشی تاك بە پێی بۆچوونی هزری سایکۆلۆجستەکان لێك دراوەتەوە، کراوە بە یاسای فێربوون بەبێ ڕەچاو کردنی بە تەکنەلۆژی بوونی کۆمەڵو زیاد بوونی خواستو مەیلی تاك بەرامبەر ململانێی پاشەڕۆژ بۆ خۆچەسپاندنو گەیشتن بە سەلماندنی خودو لەخۆ ڕازی بوون.کاری بونیاد گەرییەکان دووبارە داڕشتنەوەی یاسایەکانی دەروونزانی بووە بە هاوتەریبی لەگەڵ سیستەمی نێی جیهان، بە ڕەچاوکردنی کاتو شوێنی



یاسایەکان.واتە تێك شکاندنی هەموو ئایدیۆلۆژیەكو هزری مەنگو وەستاو بەرامبەر لێکدانەوەی کەسایەتی بونیادگەری، واتە شیکردنەوە، دووبارەکردنەوە، داڕشتنەوە،ڕێکخستنەوەو دروست کردن دوور پرنسیپەکانی فۆڕمەڵە بوون، بەڵگە هێنانەوە،دەروونزانی بونیادگەری پشت بە تەکنیکی سەردەمو بوار فراوانەکەی نائاگایی بایەخدان بە خودی تاك واتە سەلماندنی تاك بەرامبەر میتۆدی یەك ئاڕاستەیی یان یەك دووریو دەست پێکردن لە (منی)ی سەرکەوتوو. دژە شۆڕشی تەکنەلۆژیاو گۆڕانی سیستەم دوو دیاریدەی کۆمەڵایەتین کە پابەند دەبن بە کۆمەڵگە داخراوەکان.

کە ڕاڤەکردنی بڕە کۆمەڵایەتییەکانو دەروونییەکان فاکتەرێکی کاریگەرە بۆ سەرکەوتنی ئەم گۆڕانەو بەردەوام بوونی پڕۆسەی تەکنەلۆژیای سەردەم. ڕاڤەکردنی سایکۆلۆژیەتی تاكو کۆمەڵ زیاتر ئامادەی بوونی تاك ڕادەگەیەنێت بۆ بەردەوام بوونی پڕۆسەی جیهانگەریو هەزم کردنی فاکتەرە گۆڕاوەکا. لە هەموو کاتێك سایکۆلۆجیتەکان ئەوەیان دەرخستوە تاك بەهۆی کاریگەری ناوەوەی زیاتر دەبێت پاڵنەر بۆ گۆڕانو کودەتا لەسەر خود. جا دۆزینەوەی ئەو فاکتەرە دەروونییە شاراوانەی مرۆڤ کە کۆنترۆڵی خاڵە لاوازو سەلبیەکانی کۆمەڵ دەکات. دەتوانرێت بەپێی ئەوە بونیادگەری داهاتوو دابڕێژین.

لە سیستەمی نوێی جیهاندا کاریگەریەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پەیوەندییەکی دیالیکتیانەی بە ژیانی کۆمەڵەوە هەیە. کە خودی مرۆڤ چەند پڕۆسەیەکی زانستی دەروونی دەیگرێتەوە گۆڕانی ئەم پڕۆسەیە لە دیدگا دەروونییەکانی کۆمەڵدا وا دەخوازێ فاکتەری داڕووخانو کپ کردنو هەڵگەڕانەوە ڕووەو بڕەو بڕوات لە ململانێی دەروونیدا. دەروونزانی بونیادگری دەڵێت : پێکهاتنو دروست بوونی کیانی ئەو خەڵکەو وەستانی جەدەلی گۆڕانە میکانیزمییەکانی دەروون، دەبێتە هۆی لێك ترازانی تاك لەگەلچ کۆمەڵدا،هەرچەندە ئەم دابڕانە زیاد بکات مرۆڤ تووشی نامۆیی دەبێت لەناو کۆمەڵدا. بۆ دەرباز بوون لەم پەژارە دەروونییە، پێویستیەکانی

مرۆڤ بە پێی بیردۆزەی دڵنیایی ( فۆکنەر) سەر هەڵدەدەنەوە بۆ تێر بوونی پێویستییەکانی تاك،ئەمەش هۆیەکی گرینگە بۆ بەرز کردنەوەی درووشمی (بەرژەوەندییە تایبەتییەکانو بە تاك بوونی ئازادیەکان) لە لایەن خەڵکەوە. چەمکی ئایدیۆلۆژییەتی باو کە بەزۆر دەسەپێنران بەسەر تاکدا، ئەوا تووشی کوژانەوەی دەروونی دەبوو، واتە بەپێی تیۆرەکانی ( باڤلۆڤو واتسۆن) هەموو دیاردە کۆمەلأیەتییەکانو گۆڕانکارییەکان پێویستیان بە فشاری دەروونی هەیە. بە بۆچوونی (باڤلۆڤ) هەموو وروژاندنێكو جولأنەوەیەك پێویستی بە ئامادەبوون هەیە بۆ ڕەخساندنی زەمینەی وەلأمانەوەی پێویست بەرەو گۆڕان، واتە بۆ وروژاندنی کۆمەلأیەتی دەبێ وەلأمدانەوەی دەروونی هەبێت بۆ ئامادەکردنی خودی ئەو کەسەو بەکۆمەڵ بوونی تاكو پێکهێنانی وەلأمدانەوەیەکی کۆمەلأیەتیو گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکان. وەك قوتابخانەی دەروونزانی لە ئەوروپا ئەوەیان سەلماندووە کە هەموو پەشۆکاویەکی دەروونی بۆ هۆکارە جەنگییەکان دەگەڕێتەوە جەنگەڵستان دیاردەیەکی نەگەتیڤە بەرامبەر خودی تاك لەناو کۆمەڵ. تێکچونی شیرازەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵ کارتێکردنێکی درێژ خایەنی هەیە لەسەر قوڵ بوونەوەی ململانێی ونێوان منو بەزەمن کە هزرمەند لەسەر هێڵی وابەستەی دەروونی لادەدات لە میتافکرە کار دەکاتو پەرتەوازەی لە هزری فەلسەفی دروست دەبێتو کەسێتی بونیادجگەر خەفەقانی نێوان ململانێی ئەوو بەرزەمن دەبێت. هەموو دیاردەیەکی ململانێی دەروونی مرۆڤ لەژێر کاریگەری گۆڕانکارییەکانی سیستەمی نوێوە دێتە کایەوە،چونکە هەر گۆڕانێکی نوێ بارێکی دەروونی نوێ بەخۆوە دەبینێ، بەلأم ((فرۆید)) ئەم دیاردە دەروونیە دەباتەوە لایەکی تر وەك ئەوەی دەڵێت تێر نەکردنو خەفە کردنی ڕەمەکی سێکسیی دەبێتە هۆی توندو تیژی تاك لەناو کۆمەڵ (ویلیام فۆکنەر) لەگەڵ ئەم بۆچوونە بوو، بە شێوەیەکی تر باس لەبارە تێرنەکراوەکان دەکات کە ئەبلتەرناتیڤی ئەمە، کارە هەڕەمەکییەکانی خودە. لە سیستەمی کۆمەلأیەتی خۆیان لەم ماوە درێژدا هەوڵی ئەوە دەدەن



گۆڕانکاری بەسەر بهێنرێت، چونکە خودی داهێنانو هزرو ئەبستمۆلۆژیای بونیادگەری دەبی بەپێی پێوەری کاتو سەردەمو گۆڕانکاری سیستەمی جیهان بێت، چونکە دووبارە بوونەوەی دەقە بابەتییکانو چەق بەستووییو نەگۆڕانیان لای تاك وردە وردە لەگەڵ ڕۆژگاردا تووشە داخوران دەبن، بارە دەروونییەکانی مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە نوێکاری هەیە بەپێی کاتو شوێنو ڕەوتی بەرەو پێشچون بۆ زیاتر چەسپاندنو بەرجەستە بوونی کەسایەتی مرۆڤ. گۆڕانکارییەکانی ئەم دوایەی سیستەمی نوێی جیهان بەشێوەی تەئویلێکی تەمومژاوی لە هزری ڕۆشنفکرەکان لێك دراوەتەوەو گۆڕانکارییەکی هەڵە بوونو تاوان ئامێزی لە خودی مرۆڤ دروست کرد. بۆیە خەڵکان تووشی بێ ورەیی مەعریفی هاتوون..

## سەرچاوەکان


★علم النفس وميادينه ( من فرويد الى لاكان ) ممارسة علم النفس ونقده مجموعة من المؤلفين ترجمة : وجيه أ سعد — منشورات وزارةالثقافة السورية دمشق ١٩٨٥ .

★لوك فيرى- الان رينو : البنيوية فى مشروع تحديث الفرويدية- مجلة الفك العربى المعاصر عدد- ٤٠- ١٩٨٦ .

★كلود ليفي شتراوس : الفكري الترجمة د. نظير جاهل- المؤسسة الجامعية للدراسات بيروت ط ٢ ١٩٨٧.

★باشلار، غاستون : تكوين العقل العلمي ترجمة د. خليل أحمد المؤسسة الجامعية للدراسات بيروت ١٩٨٨.

★د. ذكريا أبراهيم علم النفس الفردي ونظم العالمي الجديد دار الطليعة بيروت ط١ ١٩٨٨.

★ هرسكو فيتز علم النفس المعاصر و البنيوية ترجمة د. جورج كتورة. منشورات وزارة الثقافة السورية دمشق ١٩٨٩.

٨ د.یوسف حەمە ساڵح وانەیەك دەربارەی دەروونزانی وجودی ( علم النفس الوجودی ) زانكۆی سەلاحەدین- كۆلێژی پەروەردە- پەروەردەو دەروونزانی ١٩٧٧.



# شوێنی سایكۆلۆژیا لە سیبرناتیك

كێشەی جەدەلی بوونی خود جوڵەی مرۆڤ لێرەوە دەست پێ دەكات كە بە ئامێری بوونی سایكۆلۆژیای تاك كۆتایی دێت،كۆنترۆڵە غەریزەكات لە كۆمەڵەی نیشانەی دووەمی مێشك سەر هەڵدەدات كە پرۆسەی ئاگایی ( شعوور ) ناتوانێت كۆنترۆڵی بكاتو بە پێی پێداویستی بوونی تاك ڕێك بخات، نائاگا گەورەترین پرۆسەی ڕێك خەری عیقڵی ناوەوەی مرۆڤ مكە تاك وەك بە ئامێری بوون سەیر دەكرێت. هەموو كردارە ڕەوشتییەكان پەرچەكرداریان بۆ دروست دەبێت لە نائاگاوە كە مرۆڤ پێكهاتەی غەریزەكانی سەرەكیو ناوەندیەتی. زانستی گشتی بۆ كۆنترۆڵو فەرمان كردن تەكنیكو تەنە زیندوەكانو مرۆڤ پێی دەوترێت تیۆری سیبرناتیك؛ واتە داشۆرینی هەستە گەشەسەندووەكانی مرۆڤو دروست كردنی پرۆسەیەكی ئامێری هەستەوەرەكان واتە زیندە هەستو جوڵانەوەو ڕەوشتی گۆڕاوو نەگۆڕو سۆزییەكانی مرۆڤ بەهۆی ئامێرێكی چاندراو لە شوێنی دیاری كراو كاردەكات. ئەوەی مەبەستە هەڵەكوت كردنی تاكە بەرەو چوونە ناویەكی ڕۆبۆت لەڕووی زمانو گرامەرەوە، سیبرناتیك واتە سەركردە یان كابتنی كەشتی ئەمەش وشەیەكی گریكییە كە



بەسەركردەی كەشتییەكانیان دەوت، چونكە كۆنترۆڵی هەموو بەشێكی گەورەو بچوكو ئاراسەو وەستانی ناو كەشتیەكەی دەكرد.

زانایانی سایكۆلۆژی ڕەوشت لەگەڵ فیزیاوی جەستە ((سایكۆ بایۆفیزیك)) ئەم دەستەواژەیەیان هەڵبژارد چونكە بەرامبەر كۆگا غەریزەكانی سەرتاییو بنەڕەتی مرۆڤە كە سەركردایەتی ڕەوشتی مرۆڤ دەكاتو ئاراستەو بۆچوونو پایەگەی كۆمەڵایەتیو لادانی ڕەوشتی تاك دیاری دەكاتو حەزو ئارەزوە تێرنەكراوەكان كۆنترۆڵ دەكات كە ئەو غەریزانە دوو جۆرن لە ڕووی فەسلەجی، یەكەم گواستنەوەی غەریزە بنەڕەتییەكان كە بەهۆی جووتبوونی كرۆمۆسۆمەكانی دایكو باوك كە زیاتر لە ( ٣٥ ) غەریزەیە بەبێ دەسەڵاتی تاك دروست بووە دەگازرێتەوە قابیلی گۆڕان نییە لە هەموو كەس وەك یەكە تەنانەت لە ئاژەڵیش بەراورد دەكرێ بە غەریزەی مرۆڤ؛ ئەمانە ڕۆبۆتی ڕەوشتی سەرەكی مرۆڤو خەسڵەتەكانی جیاكراوەی مرۆڤ دیاری كەن. وەك ﴿خواردن، نەستن، سێكس، سۆز، خۆشی....﴾، بەڵام جۆری بنەڕەتی دووەم سایكۆلۆجستەكان ناویان ناوە غەریزە گۆڕاوەكان واتە گۆڕینەوەی غەریزەی وەرگیراوو فێربوون بەهۆی درككردنی تاك بە غەریزەی نەگۆڕ لەژێر كاریگەریی ڕەوشتی دەرنەچوو لە فاكتەرەكانی دەوروبەر، ئەمەیان وەك گۆڕینەوەی سۆزی دایكو باوك بۆ كەسانی تر كە دەتوانرێت لە جیاتی میكانیكە ڕەوشت ئۆمەنستانە ئاراستەی غەریزەكان دیار بكەین. سیبرناتیك وەك زانستی ئەمرۆ لەلایەن زانایانی ئەمریكی (نوربرت وایز) تۆژینەوەی لەسەركرا هەوڵی ئەوەیدا هاوكێشە بیركارییەكانی تێكەڵ بە ڕەوشتی مرۆڤ بكات بۆچوونو بیركردنەوەو مەیلو غەریزەكان لەژێر ڕۆشنایی شیكردنەوەی سایكۆ-ماتماتیكی بكات،كردە مرۆڤییەكان لە سنووری ئەبستراكت پۆلین بكات.

ئەمەش دیراسەكردنێكی بەراورد كاری بوو لەنێوان توانستی كۆمپیوتەرو ئامێرەكن لەگەڵ سێڵی فەسڵەجی گیانەوەراندا ئەمەش لەكاتێك هات كاتێ زانایانی جیۆلۆجی چەندان ئامێری وردكاریان دانابوو، بۆ چاودێری كردنی بومەلەرزە

چەندان ڕاداری هەستیار بەکاری پێوەندی نێوان بنکە چاودێرییەکانی بومەلەرزە چەسپ کردو لە شوێنە جوکرافیەکان. کەچی زانای سایکۆ-فیزیك ((ماری ئەمپێر (فەرەنسی) ))لەکاتی چاودێری کردن‌و لێکۆڵینەوەدا بۆی دەرکەوت هەندێك ئاژەڵی دەوروبەری ناوچەی بومەلەزە ( ٤:٤٥:٣٠ ) چوار کاتژمێرو چل‌و پێنج خولەك‌و سی چرکە زووتر هەست بە ڕوودانی کارەساتی ڕووداوی بومەلەرزە دەکەن واتە پێش ڕاداره کۆمپیتەرەکان،بۆیە ئەو ناچەیە چۆڵ دەکەن یان جموجۆڵی نائاسایی پەیدا دەبێت لە ئاژەڵەکاندا ئەم پرۆسە بەراوردییە سەرنجی زانایانی بایۆ-فیزیکی ڕاکێشا ویستیان کۆنترۆڵی ڕەوشتی نائاسایی گیانلەبەران بکەن بۆیە تیۆری سیبرناتیك لە ساڵی (١٩٦٤) هاتە میدان. بۆ سەلماندنی ئەم کرداره سایکۆ-زانستییە چاودێری گوندێکی نزیك کەناری دەریا کرا، سەیریان کرد بە (٧,٥) حەوت کاتژمێرو نیوو هەموو مشکەکانی ئەم گوندە ناوچەکەیان چۆڵ کرد، سایکۆلۆجستەکانی ڕەوشتی ئاژەڵ دەڵێن :مشك لە هەموویان زیاتر هەست بە گۆڕانی لەرەلەری زەوی دەکات بۆیە زوو ئاگاداری کارەساتی سروشتی دەبێت چونکە گوێە ئاسایی مرۆڤ تا (١٦) لەرەلەر=چرکە دەتوانێت گوێ بیستی شەپۆڵە دەنگیەکان بێت لەوە کەمتر ناتوانێت، بەڵام مشك لە (٧) لەرەلەر-چرکە هەستی بیستنی دەجوڵێت. بۆ سەلماندنی ئەم کرداره بۆیا-میکافیکە فەسلەجیەکان لەم توێژینەوەیەی دوایی بۆیان دەرکەوت کە لە شاری (ئەزمیت)ئەو بومەلەرزەیەی ڕوویدا بە سێ کاتژمێر پێش ڕوودانی بومەلەرزەکە هەموو مشکەکان ئەو ناوەیان چۆڵ کردبوو، سەگەکان هەڵسوکەوتیان نائاسایی بوو بە تێکڕای (٣٥) جوڵەی زیاد لە خولەکێکدا.

سیبرناتیك لە سەدەی داهاتوودا سیستەمێك پەیڕەو دەکات کە توانای کۆنترۆڵکردنی کرداره خودییەکانی مێشك بکات وەك کۆنترۆڵێك بەرامبەر دەوروبور بەکاری بهێنن بەڵام کێشەی سایکۆمیکانیکی مێشك لە مرۆڤی سەردەم ئەوەیە کە مرۆڤ لە دوو بەشی تەواوکراوی کارلێکراوی بەردزام وایە کە ناتوانێت سێیەکی ئەم کردەوانەو پەرچەکردارانە کۆنترۆڵ بکات‌و بیانخاتە ژێر خزمەتی خۆیەوە چونکە هەر چەند



تاك تەکنەلۆژیا بکات لەژێر سێ ئایتمی ئەزەلی دەربازنابێت وەك (سایکۆلۆژیاو فسیۆلۆژیاو بایۆلۆژیا) کە ئەمانە لەژێر دوو سیستەمی بۆماوەو ژینگە بەرنامەکانی خۆیان ڕێك دەخەن واتە هاوسەنگی‌و گونجانی دەروونی لەم کارلێکە دروست دەبێت، بەڵام هەموو سیستەمە تەکنەلۆژی‌و ئایدیۆلۆژییەکانی جیهان خاڵی هاوبەشی لە سیستەمی جیهان خاڵی بەیەکگەیشتنیان لە ڕووی چەمکی بیرکردنەوە هەبە، واتە خاڵی هاوبەشی‌لە سیستەمی جیهان لێکدانەوەو شیکردنەوەو هەڵسوکەوت کردنی مرۆڤە بەرامبوریان. بۆ نمونە بە سیستەمی سایکۆلۆژیدا کابرایەکی کەم ئەندام پاڵ دەدات. ئەوەی دووەم دەتوانێت ببینێت‌و بڕیار بدات‌و شتەکانی دەوروبور لێکبداتەوە، بەڵام توانای جێبەجێکردنی نییە، کەچی یەکەم بە پێچەوانەی دووەم ناتوانێت ببینێت‌و بڕیاربدات، بەڵام دەتوانێت زانیاری وەربگرێت‌و کردارەکان جێبەجێ بکات.

لێرەدا لە سیستەمی نوێی سایکۆلۆژیادا دەردەکەوێت کە پیاوی دووەم هیچ کارێکی گران جێبەجێ ناکات، بەڵام زۆر گرینگ‌و کاریگەرترە لە گۆڕانی فاکتەرەکانی دەوروبەردا. ئەمەش یەکێك لە مەرجەکانی سیبیرناتیك بۆ نمونە : کەسە ((ا)) زانیاری بۆ کەسی ((ج)) دەنێرێت لە ڕێگای ڕێکخستن‌و گۆڕینی کەسی (ب)). بەم شێوەیە :




(١)

بەڵام چاکترین بیرکردنەوەی لە کاتێکی زۆر کەمدا بەم شێوە دەبێت کە کەسی ((ب)) کلیلی کردنەوەو گواستنەوەی زانیاری بێت.



(٢)

بەلاّم ئەگەر تۆڕێکی بەربلاّوت هەبێت هەموو لەیەك كاتدا زانیاری لە بنکەیەك وەرگرن وەك برووسکەی ترس لە مێشك لەیەك ساتدا بەهەموو لەشدا بلاّودەبێتەوە تاك پەرچەکردار دروست دەکات، ئەوا کۆنترۆلی بەم شێوەیە دەبێت :

(٣)




کارتێك یان دیسکی بەرنامەکراو دەخەینە نا ئامێرێك کارێکی دەستنیشان کراو دەکات،کاری سیبرناتیك لە مرۆڤدا دروست کردنی ئەو کارتە یان دیسکەیە کە کۆمەڵێك بەرنامەی کار لە مرۆڤدا لەکاتی پێویستو درووژاندنی دەرەکیدا دەکات، کە کۆئەندامی ناوەندی مێشك کۆنترۆڵی دەکات، بایۆ-سیبرناتیك ئەو زانستە گەیانییە کەوا ئاراستەی کارو فرمانەکان بەهەموو ئەندامەکانی تەنی زیندوو بلاّودەکاتەوە مرۆڤ وەك بنکەی کۆمپیوتەر سەیر دەکات. سایکۆلۆجستەکان ئەوەیان دەرخستووە کە دەتوانرێ بەرنامەی کۆمپیوتەر بە وردەکارییەوە لەگەڵ مرۆڤدا تێکەڵ بکرێت لەگەڵ بوونی جیاوازی لە نێوان مرۆڤ-ئامێردا، دەتوانرێت کۆنترۆڵە خودییەکان لە هەستەوەرە ناوەکییەکان جێبەجێ بکرێت. واتە زانانەدنی یاسایەکی نوێ کە بەدەنی زیندوو مامەڵە لەگەڵ زانیاریی ناو بەدەنی خۆی بکات کە پێی دەوترێت زیرەکی بایر-ئامێرییەکان. ئەمەش تێگەیشتنە لەکارکردنی دەماغی مرۆڤ چۆنیەتی بەکارهێنانی کارتی زانیارییەکانو ڕاکێشانی لەکاتی پێویست واتە شیکردنەوەی چەندایەتی ڕەوشتی گیانەوەرو چۆنیەتیی هاندراوەکانی ڕەوشت. بەراوردکردنی هاوکێشەی ماتماتیکی لەگەڵ گۆڕاکارییەکانی جینەکانو کرۆمۆسۆمەکان.تۆژینگەی سیبرناتیك دوو جۆرن ؛ ئەو بەشەی کەوا دیراسەو لێکۆڵینەوەو وەسفی فرمانەکانی غەریزەکان کاری سمباپاوی دەست نیشان دەکات،



کۆنترۆڵی فرمانەکانی دەکات پێی دەوترێت سیبرناتیکی ناوەوە. زۆر لە زانایانی سایکۆلۆژی هەوڵی ئەوەیان داوە خودڕاگیری لە تەنە زیندەوەرەکان بکەن لە ڕێگای (( تغذیە المرتدە)) ئەمەش بچوکترین پرۆسەی ڕەوشی زیندەوەرە. بەلاّم خودە کۆنترۆڵی ڕەوشتە گۆڕاوەکانی غەریزەو ئایتمەکانی گونجاو لەگەڵ دەوروبەر پێی دەوترێت سیبرناتیکی دەرەوە. زانایانی فەسلەجی دەماغ لەکاتی دانانی دڵی دەستکرد بۆ نەخۆشێك ئەوەیان بۆ دەرکەوت ئەگەر هاتوو ئامێری دوورە کۆنترۆڵ هەبێت ئەوا دەتوانن زۆر لە ڕەوشتەکانی تاك بگۆڕنو کۆنترۆڵی بکەن، بەلاّم ئەگەر هاتوو ئامێرێکی زۆر بچوکتر لەناو دەماغ چێنرا ئەوا دەتوانرێ بەرێگایەکی زانستی ئاسانتر بکرێتو بخرێتە ژێر ئیحای دەرەکیو زۆر لە بەرنامەی کاری فەسلەجی دەماغ بگۆڕدرێت بەپێی پێویست ڕەوشتی ئاراستە بکرێتو بخرۆێتە ژێر ئیحای دەرەکیو چەندان کرداری پێ ئەنام بدرێت بەلاّم هەرگیز ناتوانرێت کرداری میتاپۆلیزم لەتەنی زیندوو ڕابگرێت. .

## سەرچاوە


١-السیبرناتیة النظریة العامة لتحکم، د. نزار حمدون شکر، مجلة (العلوم)، العدد ٨.

٢-السیبرناتیك وعلم النفس، د. ریمون شکوري، مجلة أفاق الجدید، العدد (٣١)، ١٩٩٧.

٣- نظریة التحکم الذاتي للانسان. د. طالب ناهي الخفاجي، مجلة الجامعة العدد (٢٨)، ١٩٩٧.

١٠٠

# بەجیهانیکردنی پاراسایکۆلۆژی

نیتشە لە دەمی زەردەشت لە مرۆڤی سوپرمان دەكات كە هەموو دەسەلاتی عەقڵ دەبەزێنێو توانایەكی هێزی ڕادەبەدەری هەیە، ئەمەش یەكەم بوو باسی ئەودیوی دەروونی دەكرد كە لە مرۆڤی سوپرمان بەدی دەكرد.

پاراسایكۆلۆژیا وەك دەستەواژە بریتییە لە دوو بڕگە ((پارا)) هەندێ جار بەنزیك دێتو هەندێ جار بە مانای لە ((دوا)) دێت، بەلام سایكۆلۆژی واتە دەروونزانی، بەلام زانای فیزیاوی فەرەنسی (شارل رینیە) بە لە دوادەروونزانی ناوزەدی دەكر واتە بوون لەگەڵ رووح.

پاراسایكۆلۆژیا مانای بەزاندنی هەموو سنووری توانای عەقڵو هەڵوەشاندنەوەی دەسەلاتی دیاری كراوی عەقڵ ئەوكاتە كۆنترۆڵكردنی پڕۆسەكانی هێز نامێنێت، زەمەن ەدەكەوێتە خێرایەكی زۆر كە بە بەراوردكردن لەگەڵ زەمەنی تەمەن كێرڤی زەمەن سفر دەبێت.... بۆ نمونە ئەگەر دوو كەس لە بواری شەپۆلی دەنگو بیستن قسەبكەن ئەوا بەهۆی ناوەندی هەواو بەریەككەوتنی گەردەكان شەپۆلەكان دەگوازرێنەوە...ئەگەر دووری نێوان نێرەرو وەرگر لە پێوەری فیزیاوی دوورتر بوو ئەوا شەپۆلەكان بلاودەبنەوەو ناگەنە خالی دیاریكراو، ئەوكاتە پێویستمان بەناوەندێكی تر دەبێت بۆ مەودایەكی دوورتر وەك جیهازی بێ تەل یان پێوەندی سەتەلایتی كە لە دووریەكی بەژ شومار شەپۆلە دەنگییەكان دەگوازرێتەوە، هەموو بەربەستێكی هەوایی شەپۆلی ڕادیۆی كهرۆموگناتیسی دەبڕێت، ئەگەر وا دابنێین ئەو جیهازە بێ تەلە توانای سێلەكانی مێشكەو ئەوا دەتوانێت ئیجا بنێرێتو هەموو





سنووره دەستكردو سروشتییەكان ببڕێت لە پێوەندیكردنی لە دووریەكی زۆرو زانینی نهێنییەكانی بیركردنەوەو ئاشكراكردنی پرنسیپەكانی گەورە پیاوانی بازرگانیو سیاسیو سەربازی بێ ئەوەی ئاگاداری خۆی بێت واتە هەموو نهێنیەكانی مرۆڤ لە كۆگای مێشك حەشاردراون بەهۆی (تەلەباسی)و گواستنەوەی بیرو باوەڕ ئاشكراو كراو دەبن لەبەردەم مرۆڤی پاراسایكۆلۆژی. پاراستنی سایكۆلۆژیا دیاردەیەكە ئێستا كۆنترۆڵی فیزیای وردبینی كردووە، ناتوانرێت لەبیربكرێت كە بەزانستی حەوتەمی دنیا دەژمێردرێت لە ڕووی گرینگییەوە لەدووای زانستی فۆتۆكۆپی ئادەمیزاد دێت. تەنانەت لەڕووی سەربازیو تەكنەلۆژیا كاریگەری لە بۆمبی هایدرۆجینی گەورەترە، چونكە دەتوانێت هەموو نەخشە نهێنییە ئاخنراوەكان لەناو مێشك بدزێتو لەهەمان كاتدا نەخشەو كلیلو نهێنی پێچەوانە لەناو مێشك دابنێتو ئەنتی ئایدیای تەكنەلۆژیا دروست دەبن. وەك چۆن ڤایرۆسی كۆمپیوتەر كارەساتێكی گەورەیە لەسەر بەرنامەو نەخشەی كۆمپیوتەرو دەبێتە سڕینەوەی هەزاران كلیلو نهێنی سەربازیو تەكنەلۆژیو دروسكردنی ئەنتی دیسك لەناو كۆمپیوتەردا.

بەلام بە جیهانی كردن (گلۆبالیزم) واتە هەڵوەشانەوەی هەموو سنووره دەسەلاتدارەكانی پێوەندی ئابووریو كۆمەلایەتی دوور لەیكترو كۆكردنەوەی گەورەترینو بەهێزترین پڕۆسەی زانستیو زانیاری هەوالگەری لەخالی چەقی شاشەی كۆمپیوتەردا. هەموو گێتی بەهۆی ملیۆنەها تۆڕی ئەنتەرنێت بەیەكەوە بەستراوە بیروباوەڕو زانیاری بەشێوەیەكی ئازادانە بێ سانسۆری سنوور دەگوازرێتەوەو ملیاران خەڵك سوودمەندن، لەهەمان كاتدا عەولەمە سودو زیانی هەیە، بەپێی بۆچوونو لێكدانەوەی بەرژەوەندی دەوڵەتو تاكو گرووپ دەگۆڕێت، بەلام لەڕووی دەروونییەوەی عەولەمە كە بلۆك بەندی هەموو ئایدیۆلۆژییەتو میتۆدی سیاسیو ئابووری باز دەداتولەدوای ئەمانە كار دەكاتو ڕەنگە عەولەمەكردنی شارستانییەتی مرۆڤ هۆكاری گرنگ بن بۆ هەڵوەشاندنەوەو لە ڕەگ

هاتنی سنووره دەستکردەکان. کە هەموو پارچە جوگرافیا لێکدابڕاوەکانو کۆمەڵە داخراوەکان لێك نزیك بکاتەوە ئەو عەولەمەش خاوەنی (٦ر٥) ملیۆن تۆڕی بەیەکبەستراوی کۆمپیوتەر بە بەشداری (٧٥٠) ملیۆن هاولاٌتییە کە لە دەقیقەیەکدا (٣١)ملیۆن زانیاری ئاڵوگۆڕ دەکرێت لە سەرتاسەری جیهان بەهۆی مانگی دەستکردو سەتەلایت. پاراسایکۆلۆژی هەر لەسەرەتاوە مرۆڤ توانیویەتی کاری پێبکاتو تەنانەت زۆر لە ئاژەڵەکان لە ناهەستەوە پاراسایکۆلۆژی سروشتیان هەیە بەر لەڕوودانی (بورکانو بومەلەرزەو ئاگرو لافاو... تەنانەت زۆر لە سەگەکان پێش مردنی خاوەنەکانیان دەزانن). لەترسی ڕووداوەکان هەستی پێ دەکەنو ئەوشوێنە چۆڵ دەکەن، چونکە هەستەوەرەکانیام توانایەکی زۆر وردیان هەیە کە دەتوانن مامەڵە لەگەڵ (پرۆتۆنو نیترۆن) بەهۆی شەپۆلی کهرۆموگناتیسی بکەن... تەنانەت لەسەدەی نۆزدەمدا لە تونێلەکانی خەڵوزی بەرد کە کرێکارەکان کاریان تێدادەکرد بەهۆی داتەپینی تونێڵەکە دەبووە هۆی لەناو چوونی کرێکارەکان...تا دوایی بۆیان دەرکەوت کە باڵندە جۆرە هەستێکی هەیە کە پێش ڕووخانی تونێڵەکە بەهۆی گازی دەرچوو لە ناخی زەوی کە باڵندەکە یەکسەر بەهۆی غازەکە تێ کدەچێو دەمرێ ئەوکاتە کرێکارەکان ئاگاداردەبنەوە یەکسەر تونێڵەکە بەجێ دەهێڵن پاش چەند دەقیقەیەك تونێڵەکە دەرووخێ. بەتایبەتی (کەناری) زۆر هەستیارە بە گازە تەقیوەکان.. پاراسایکۆلۆژیا نەك لەبواری سەربازیو بازرگانیو کاری تایبەتی دەوردەبینێ بەڵکو لەبواری نەخۆشی کە لە زۆربەی ولاٌتانی ئەوروپاو ڕووسیا دەیان نەخۆشخانە بۆئەم مەبەستە هەیە... بۆ نمونە کاتێ کابرایەك تووشی نەخۆشی شەکرە دەبێت لەم نەخۆشخانەیە دەکەوێتە ژێر باری خاوبوونەوەی بەدەن ئنجا ئەو کەسەی پاراسایکۆلۆژی دەکات بەهۆی (ئیحا)وە لە ڕێگای شەپۆلە ڕادیۆیە کهرۆموگناتیسییەکان کار لەو هۆرمۆنە دەکات کە بەر پرسیارە لە ڕژانی ئەنسۆلینو ڕێکخستنی لە خۆێن کە دەبێتە ڕێکخستنەوەی ڕادەی شەکر لە خوێن، ئەم کردارە چەند جارێكو دانیشتنێك دووبارە دەکرێتەوە تا هۆرمۆنی بەرپرسیار لە شەکرە





دەورووژێنرێتو دووبارە چالاك دەبێتەوەو دەیان نەخۆشی تر بەم شێوەیە چارەسەر دەکرێت. تۆڕەکانی پاراسایکۆلۆژیا لە مێژوویەکی زووەوە عەولەمەی بەسەرداهاتووە لە گشت جیهان پێوەندی دەروونی کراوە، بۆ یەکەم جار بەشێوەی تاقیگەی لە ساڵی (١٩٢٠) لە ڕووسیا بوو کە لەلایەن قوتابی زانکۆی لینینگراد (ڤاسیلیف) بوو، بەلاٌم لەو کاتە تەنیا لە بواری زانکۆو بۆ کاری جاسوسی بەکار دەهات تا ساڵی (١٩٧٤) بەشێوەیەکی نهێنی بەکاردەهات، بەلاٌم لە ساڵی(١٩٨٢) لە (٣٠) دەوڵەتی جیهانی نزیکەی (٢٠٠) تاقیگەی پاراسایکۆلۆژی هەبووە، لە ساڵی (١٩٨٩) لە شاری (لەندن) بنکەی جیهانی بۆ گۆڕینەوەی زانیاری پاڕاسایکۆلۆژیا دامەزرا کە (٦٧ ) دەوڵەت لەسەر ئاستی جیهانی بەشداریانتێدا کردو نزیکەی (٨٣٠) تاقیگەی پاڕاسایکۆلۆژیاو (٣٠٠٠) لێکۆڵینەوەوو تاقیکردنەوەیان پێشکەش کرد. لەم بنکەیەدا ئەوە ڕاگەیەنرا کەوا پاڕاسایکۆلۆژی جیهانێکی تایبەتی (سایکۆبایۆ فیزیك) لەسەدەی داهاتوودا شوێنی هەموو زانستەکان دەگرێتەوە زانستی هەرەگرینگو ئاڵۆزی ئەو کاتە دەبێتو هەموو جیهان لەیەك خاڵی تەلەپاسی مێشك کۆدەکاتەوە. پاراسایکۆلۆژی زانستێکە ملکەچی هەموو یاساکانی لێکدانەوەی کیمیایی-فیزیایی دەبێت. سایکۆلۆجستەکان دەڵێن ئەگەر دایککێك هاتەلات وتی ئەمشەو خەونم بینیوە کوڕەکەم شتێکی بەسەر هاتووەو دڵم تەنگە. دووای یەك هەفتەنامەیەك لە کوڕەکەوە هات کە لە هەمان کاتی خەونی ئەو دایکەدا کوڕەکە تووشی کارەساتێك بووە. ئایا ئەو کاتە لێکداوەی سایکۆلۆجستەکان چۆن دەبێت، دەیان نمونەی تر لەم جۆرە کە لێکدانەوەیان ئاشکرا نییە بۆ لێکدانەوەی جیهانی کردن (عەولەمە) چەندین لێکدانەوەی زانستیو ئایدیۆلۆژیاو نەتەوەییو تاکی هەیە کە هەر یەکەو لە ڕوانگەی بۆچونەکانی (تاك-کۆمەڵ) عەولەمە شیدەکاتەوە، بەلاٌم ئەو لێکدانەیەی بۆ پاراسایکۆلۆژیا کراوە تەنیا دوو لێکدانەوەیە کە هەمان لێکدانەوەی عەولەمە دەگرێتەوە :

## لێکدانەوەی میبۆلۆژیا بۆ پاراسایکۆلۆژیا

دەڵێن:ئەو هێزە بێ سنوورەی مێشك بەهۆی نزیکبوونەوەی نیازك لە زەوی کارلێکردنی بەهۆی تیشکەوە کە پێش نیوملیۆن ساڵ ئەو کەسانەی ئەو کاتە ژیاون توانای ڕادەبەدەری شەپۆلی مێشکیان هەبووە بۆ (تەلەپاسی، قسەکردن لەدوور، دوواندنی رووحی مردوو....). بەڵام بەشێك لە سایکۆ-ئەنترۆبۆلۆجیەکان.

دەڵێن :دە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا شارستانیەتییەتێکی زۆر پێشکەوتوو هەبوو بەر لە مێژوو پێش چاخی بەردینی یەکەم کە بەدوورگەی (ئەتلنتا) ناوی دەرکردبوو لە زیاریالووشی ئارام نزیکی (٥) هەزار ساڵ ژیاون زیاتر لە (٢٥٠) ملیۆن کەس دەبوون،مرۆڤەکان کورتەباڵاوسەرگەورە بوون دەستیان لە قاچیان درێژتر بوو ڕەنگی خوێنیان شین بوو،تیشکی خوارو سور کاریان تێنەدەکرد... ئەم کیشوەرە لە شارستانیەتو تەکنەلۆژیا لە ڕادەبەدەر پێشکەوتوو بوون پێوەندیان لەگەڵ ئەستێرەکانی ترەوە هەبووە،ئەمانە توانای عەقڵیان زۆر بەهێز بووە چاویان تیشکی (ئێکسو گاما)یان دەردەدا بەهۆی خاوبوونەوەی خانەکانی مێشك پێشبینی هەزاران ساڵیان کردووە لەگەڵ پێشبینی بورکانو بومەلەرزەو مردنی گەورەکانی خۆیان...ئەم شارستانییەتە بەهۆی شەڕی ناوکە ئەتۆمیو هادرۆجینی لە نیووان خۆیان یا جەنگی ئەستێرەی لەگەڵ هەسارەکانی تر کە ناویان لێنابوون جەنگی (تالوپ)واتە داگیرکردن کە بووە هۆی لەناو چوونی کیشوەرەکە بەتەواوەتی تەنیا هەندێکیان نەبێت کە میسۆلۆجیەکان دەڵێن ئەوانەی ڕزگارین بوو، بەشێکیان بەسەرکردەی (هیبوگریت) چوون بۆ میسرو لەوێ ئەهرامەکانیان دروست کرد، بەشێکیان چوون بۆ یۆنانو بەشێکی تر بە سەرکردەی (ئمالوپ) چوون بۆ بابل لەوێ بوون بە سەرکردەی ئەوکاتەی بابل.. (حامورابی) دووای چێنج پشت دەبێتە نەوەی ئەوان. بە پێوانەی ئەم لێکدانەوەیە بێت ئەو کەسانەی ئێستا توانای پاراسایکۆلۆجیان هەیە دەچنەوە سەر خەڵی ئەتلەنتا، بەڵام لێکدانەوەی دووەم بۆ





پاراسایکۆلۆجیا لێکدانەوەی زانستی (فیزیایی-کیمیایی)یە لە مێشك زۆر بەڵگە هەن کە ڕاستی پاراسایکۆلۆژیا دەسە لمێنن بە زانستی سەدەی داهاتووی دادەنێن، (باڤلوڤ) لە سەرەتای سەدەکانی ئێستا باس لە هەستیاری شەشەم دەکات کە پێوەندی لەگەڵ عەقڵی ناوەوە دەکەن گەلێ جار لە بیرکردنەوەیەکی قوڵو خاوبوونەوەی خانەکانی مێشك عەقڵی دەرەوە زۆربەی کارەکانی دەداتە عەقڵی ناوەوە کە هێزێکی هەستی بەرزی هەیە،ئەمەش بەپێی بۆچوونی زانایانی فسیۆلۆجی (باڤلوڤ-هیس). هەموو کەس هەستیری شەشەمی هەیە،بەڵام هەموو کەس ئامادەی هەستی تێدا نییە بۆیە تەنیا (١)بۆ(١٠)ملیۆن کەس ئەم ئاوادەییەی تێدایە کە عەقڵی ناوەوە دەیکات، بەڵام گەلێ جار کرداری لەوە گەورەتر دەکرێت کە پێی دەڵێن هەستیری حەوتەم ئەمەش تەنیا لە مرۆڤی هەسارەکانی تر هەیە.

## لێکدانەوەی ئەنیشتاین بۆ پاراسایکۆلۆژیا

ئەنیشتاین دەڵێ هەموو تەنێك لە گەردوون ئەنتی خۆی هەیە بۆ بەردەوام بوونی کاتو شوێنی ئەو تەنە بچووکانە کە بەهۆی وزەی حەشاردراو لە بارگەکەیانو ئەنتی خۆیان دەدۆزنەوە،گەردیلە لە ئەلیکترۆنی نێگەتیڤ پێك هاتووە کە بەخێاری یەکجار زۆر دەخولێتەوە بەدەوری ناك ( پرۆتۆنو نیترۆن)، لە دەرچوون سەربەست نییە تەنیا لەکاتی کارلێککرد نەبێ... بەڵام بە بۆچوونی ئەنیشتاین ئەنتی ئەلیکترۆن هەیە بەشێوەی ئەلیکترۆنی پۆزەتیڤ پێی دەوترێ (پۆزەترۆن) لە جوڵانەوەو خێرایی دەگاتە خێرایی فۆتۆنو بەشێوەیەکی سەربەست دەجوڵێتەوە... ئەگەر مرۆڤ توانای هەبێت بەهۆی شەپۆلی کهرۆموگناتیسی دەرچوو لە مێشکی مرۆڤ کۆنترۆڵی پۆزەترۆنی کرد دەتوانێت لەبواری ئەم وزەیە کار بکاتو هەستیاری شەشەمی پێ دەڵێن دەبێتە هۆی گواستنەوەی هزرو خوێندنەوەی دوورو شاراوەو جوڵانەوەی شت بەبێ دەست لێدانو قسەکرد لە دوورو قسەکردن لەگەڵ رووح... هەمووی بەهۆی ڕێکخستنی ئەم پۆزەترۆنیەوە دەبێت... وەك شەپۆلی ڕادیۆییو تەلستار... ئەو ئەلکترۆنە پۆزەتیڤانە (٩٩٪)بەخێرایی فۆتۆن دەجوڵێتەوە دەتوانن

هەموو بەربەستە تەنەکان بېڕن بەبێ ئەوەی شێوەو قەبارەیتەنە بەرکەوتووەکان بگۆڕێت.

## لێکدانەوەی گشتی بایۆ – فیزیاوی

١- چاوی سێیەم : ئەمەش خاڵێکی کۆکراوەیە لەسەرووی نێوان هەردوو برۆ کە ڕووبەرەکەی یەك مایکرۆملیمەتر دەبێت، پێی دەوترێ ئیزاعەی هزرو مێشك بەهۆی ناردنی شەپۆلی کهرۆموگناتیسیو کۆنترۆڵکردنی (پۆزەترۆن) دەتوانێت بۆ کەسی بەرامبەر ئەو شەپۆلانە بنێرێت نهێنیەکانی فیکرو هزر بخوێنێتەوە یان کار لە چاڵەکانی (رۆناڵد) بکەن کە تایبەتە بە نووستن واتە کاری (خەواندنی موگناتیسی) یان قسەکردن لەگەڵ ناهەست کە زاڵ دەبێت بەسەر کارە خۆنەویستیەکان بایۆلۆجیەکان لە ڕووی توێکارزانیەوە دەڵێن، چاوی سێیەم دەکەوێتە سەر ڕژێنەکانی سنووبەری.

٢- تەلەپاسی :

واتە گواستنەوەی هزر لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر لە دووریەکی زۆردا، لە ساڵی (١٨٨٢)یەکەم کۆمەڵی بەریتانیا بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم دیاریدەیە دروست بوو. تەلەپاسی پێی دەوترێ ( پێوەندی تیشکی بایۆلۆجی) کە شەپۆلی کهرۆموگناتیسی دەردەدات وەك زمانەی رادیۆ سێکردار دەکاتە هەوایی‌و لەرەلەرو دروست بوونی وزە. لەناو مێشك ئەم کردارانە ڕوودەدات... ئەمەش لە جەنگەکان بەکار دێت بۆ پێوەندی کردنو یان بەدەر خستنی زانیاری دوژمنو ئاشکراکردنی پیلانەکان. (د. سیرجی) سۆڤیەتی لە ساڵی (١٩٧٤) تاقیکردنەوەی لەسەر مشك کرد؛ کۆمەڵە مشکێکی هێنا کە بەیەکەوە ژیابوون هەندێکی لە ژوورێك دانا ئەوانی تر لەدووری (٣) کم لە ژوورێکی تر داینان کە نزیکەی (٥٠) مشك دەبوون (د. سیرجی) دەستی کرد بە کوشتنی یەکە یەکەی کۆمەڵەی یەکەم سەیری کرد ڕەوشتی کۆمەڵەی یەکەم





گۆڕاوەو باری هستریا لە مشکەکان زیادی کردووە ئەمەش ئەو پێوەندیە نهێنییە ڕۆحییە دەردەخات لەنێوان کەسە نزیکەکان.

٣- شون هەڵگر: ئەمەش کردارێکی کۆنە تەنانەت لە کوردەواریدا زۆر کەس هەبوون ئەم کردارەیان کردووە واتە ئەو کەسانە توانایەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە کە شوێننی بەجێماوی کەسێك یان تەنێك دەدۆزنەوە بەهۆی شەپۆڵە ڕادیۆکانی دەرچوو لەناو مێشك تەنانەت لە بیابانەکان زۆر کەس بەهۆی شەپۆڵە کهرۆموگناتیسیەوە دەتوانێت ئاو بدۆزێتەوە ئەمەش بەهۆی کارلێکی بواری شەپۆلی مێشك لەگەڵ بواری شەپۆڵەکانی دەوروبەردا، زاناکان بەهۆی تاقیکردنەوە بۆیان دەرکەوت ئەو بەشەی پێوەندی هەیە بە شون هەڵگر خاڵێکی مێشکە نزیك ڕژێنە نوخامیەکان،کە توانای وەرگرتنو دانەوەی شەپۆلە موگناتیسیەکانی هەیە.

٤-وێنەکردنی هزری (سایکۆفۆتۆ): واتە وێنەکردنی ئەو بابەتەی لە مێشکایە یان فۆتۆکردنی هزری ناوەوە بەپێی ئەوکەسە کە تەخەیولی بۆ دەکات بەبێ سنوور هەر جۆرە شێوەیەك بێت یان کامیرای فۆتۆ لە دووری چەند سانیمەتر دادەنرێتو لە عەقڵی ناوەوە تەرکیز لەسەر فیکرەیەك یان تابلۆیەك دەکاتو یەکسەر کامێرا وێنەکە دەگرێ. ئەم دیاردەیەش پێی دەوترێ (سایکۆفۆتۆ). زانا ئەمریکییەکان زۆر تاقیکردنەوەیان کرد لەسەر کابرایەکی پاراسایکۆلۆژی کە ئەم دیاردەی (سایکۆفۆتۆ) هەبوو. کابراکیەن خستە ژوورێکی (فارادایی) واتە لە شووشە دروست کراوی بە گرافیك داپۆشراوی ڕەنگ تاریك کە ڕێگا بە هیچ تیشکێك نادات بچێتە ژوورەوە کامێرای فۆتۆیان دەرەوەی ژوورەکە دانا.. دوایی دەرکەوت ئەم کابرایە کە ناوی (تدسایروس)ە توانای ئەوەی هەیە کە بەپێی بیرکردنەوەی عەقڵی ناوەوە بەهۆی پێوەندی روحی وێنەکان لەسەر کامێرا بگیرێتو ئەمەك دیاردەیەش تا ئێستا لە (٣٥) تاقیگەی وەك زانستی چوارەم هاتە کایەوە لەسەردەمی دروست بوونی مرۆڤ تاوەك سەدەی نۆزدەم نەخشەی مێشك بەپێی کات دابەش کرابوو بۆ پێنج پڕۆسەی وشیاری (ئاگا، نووستوو، لەنێوان هەردووکیان، نەمانی وشیاری، مردوو)،

بەلاَم بەهۆی پاراسایکۆلۆژیاوە زیاتر لە (٢٣) پرۆسە بۆ مێشك دیاری کراون.. دەتوانرا بەهۆی پاراسایکۆلۆژیا بۆ ماوەی (٣)یان (٤) دەقیقە لێدانی دڵ ڕابگرێت یان کرداری میتاپۆلیزمی لە لەش کۆنترۆڵ بکرێت. ئەمەش پێی دەوترێ (ڕێکخەری خودی روح)،ئەو کەسانەی کەوا کرداری پاراسایکۆلۆژی دەکەن پلەی گەرمی لەشیان بەرزترە، لە کەسانی تر لێدانی دڵیان خێراترە، پاڵەپەستۆی خوێن دەبێتە ( ٢٠٠ملم جیوە)کرداری پاشەڕۆ زووتر دەبێتو کرداری میتاپۆلیزم زووتر دەبێ. شەپۆلی (ئەلفا، دەلتا)ی مێشك زۆر خێراتر دەبێت.

پاراسایکۆلۆژیاو عەولەمە وەك دوو زانستی سەدەی بیستو یەك لەوانە بەشی زۆری لێکۆڵینەوە زانستیو فیکرییەکان لەسەرتاسەری جیهان داگردەکات، پاراسایکۆلۆژیاو عەولەمە واتە نەمانی سنوور بۆ دەسەلاَتی مرۆڤو گەمارۆدانی هزری تاكو ئازادی ڕادەربڕینو جولاَنەوەی تاك لە بلۆك بەندییەکی تەسك... لە ڕووی دەروونی عەولەمە واتە ئازادی رەهای خودی تاك بەرامبەر بە جیهانو نەمانی دروشممی(ممنوعو مرغوب)و فشارە کۆمەلاَیەتییەکان لەسەر تاك لاببرێتو مەزهەبو نەتەوە لە بەرامبەر جیهان دوو فاکتەری خودیو تاکی (فردی) دەبن وەك لەوەی تاك پابەندی گرووپێك یان کۆمەڵێك بێت تێیدا (مسەیەر) بێت... هەموو کۆمەڵگایەکی ئەم زەمینە ناتوانێت بەرامبەر کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بەرگری بکات،چونکە دیاردەی گەشەسەندنێکی خێرای سەدەی داهاتووە. هیچ کەسێك بچووکترین کاری بۆ جێبەجێ ناکرێت بەبێ تۆڕی کۆمپیوتەر هەموو کارە قورسەکانی ژیان دەتوانرێت لە ڕێگای ئەنتەرنێت بکرێت نەك لەبەر ئەوەی عەولەمە دیاردەیەکی شارستانییەتە بەڵکە بەپێی سایکۆلۆجستەکان بەهۆی خێرایی راپەڕاندنی کارەکان و کەمی زەمەن ناچار دەبین بچینە بازنەی عەولەمە کردنی زانست و تەکنەلۆژیا چونکە هەر یەك لە تاکەکانی ناو کۆمەڵ ئەگەر تەمەنێکی ناوەندی بژێت (٥٠-٦٠) ساڵ لە رۆژهەلاَت و ئەفریقیا دەژێت کەوا ئەو تەمەنە زۆر کەمە و بەشی ناکات،چونکە بەپێی دەروونزانەکان تاك هەر ساڵێکی ئەنتەرنێت بە





(١٥) ساڵ لە تەمەنی خۆی دەبڕێت، جا ئێمە پێویستمان بە زەمەنێکی خێرایە بۆئەوەی هەموو دەسەلاَتە سەپێنراوەکانی زانست هەزم بکەین.

پاراسایکۆلۆژیا واتە مێشکی ئامێری تاك و چوونە ناو کۆمپیوتەری دەماغ و لێکدانەوەو خوێندنەوەی هەموو عەقلێیەتەکان بەچاو پۆشین لە دووری و کات.

پێوەندی کردنی عەقلی لە دوورییەکی زۆرەوە بە چەند چرکەیەك لای ئێمە سایکۆلۆجستەکان ئەو کارەی ئەنتەرنێت و پاراسایکۆلۆژیەت دەیکات لە بازنەی بە عەولەمەکردنی کرۆڤە چونکە گەورەترین کێشەی زانستی سالاَنی داهاتوو زۆر بوونی دیاردەی پاراسایکۆلۆژییە رەنگە ئەنتەرنێت بەرامبەر ئەم زانستە شاراوەیە (هەستیاری شەشەم) هەموو بەرنامەکانی بگۆڕێت.ئەمڕۆ پێویستمان بە عەقلێیەتی عەولەمەو پاراسایکۆلۆژیا هەیە بەرامبەر بەکارەساتەکانی سروشت کە هەڕەشە لە بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی دەکات وەك (دیاردەی نینۆ، تەقینەوەی نیازك لەسەرخۆر، کەم بوونی گازی ئۆزۆن((O3))،توانەوەی بەفری بەستەلۆکی باکوور و باشوور...) کە رەنگە مێشکی زۆر لە زانایانی ئاڵۆز کردبێ و پرسیارێك دێتە ئاراوە ئایا کرەساتی کێشوەری ئەتلەنتا لە سەدەی داهاتوو دووبارە دەبێتەوە، زەوی بزر دەبێ یا هێزی تەکنەلۆژیا دەتوانێ ئەم دیاردانە چارەسەر بکات.

زۆر لە مۆنۆپۆلەکان لە ژێر کاریگەری بەرژەوەندیی کۆمپانیکانیان پرۆپاگەندەو تەرویجی جیهانگیری دەکەن و دەیانەوێ سنووری سێبەری کاپیتالەکانیان فراوان بکەن،بەلاَم رەها بوونی جیهانگیری لە سنووری دەسەلاَتی ئەو مۆنۆپۆل و بنکەی کۆنترۆڵی زانیاری دەردەچێت و دەبێتە کارێکی کەسی تاکی سەردەم دەیەوێت لە گۆشەگیری و نامۆبوون و داچەپاندن کە شەڕی گێتی و ناوخۆییەکان بەسەر بوونی تاك چەسپێندوویانە دەربچێت بوونەوەرێکی کۆمەلاَیەتی لە گۆشەیەکی دەروونی کە خۆی هەڵیدەبژێرێت جیهان بخوێنێتەوەو خوێندنەوەیەکی قووڵی بەرامبەر دوا ئایدۆلۆژیەت هەبێت،واتە عەولەمە جیهانێکی ئیستاتیکی تازەی تەکنەلۆژیایە...

## سەرچاوەکان


ویل دیورانت. قصة الحضارة، ترجمة: محمد عابد-ج٢-القاهرة-١٩٨٨.

جورج سارتون. تاریخ باراسیكولوجیا، ترجمة: محمد أدیوان-بغداد-١٩٨٨.

ناجي البصام. تنظیم العام و باراسیكولوجیا-مجلة الادارة-بغداد-١٩٨٩.

د. محمد عبدالفتاح. اسس الباراسیولوجیة و العالم الجدید-مجلة العلوم-بیروت-١٩٩٠.

محمد سلامة. شبكة الانترنیت و باراسیكولوجیا- مجلة الاداب- جامعة بغداد-١٩٩٣.

جمال سلمان. عالم بلا حدود- دلیل كومبیتر عمان- ١٩٩٦.


# پاراسایکۆلۆژیا لە هەزارەی سێیەمدا

لە کۆتایی هەزارەی دووەمدا سایکۆلۆژیست ((ولهام ڤۆنتی))ی ئەڵمانی بۆ یەکەم جار دەرگای تاقیگەی کردەوە لە ڕووی دەروونزانیدا، یەکەم کرداری کورت کردنەوەی ڕەوشتی بەکارهێنا دیاردەی گواستنەوەی ڕەوشت لەگەڵ گونجانی دەوروبەر ڕاڤە کرد، ((ڤۆنت)) لە تاقی کردنەوەیدا دوو سندووقی بەیەك بەستراوی بەهۆی



ڕێڕەوێك دروست کرد، لە سندووقی یەکەم هەندێك مشکی سپیی دانا لە سندووقی دووەم کە تاریك بوو خواردنی دانا لەگەڵ تەزووی کارەبا، کاتێ مشکەکان بۆ خواردن دەچوونە سەندووقی دووەم ئەوا کارەبا دەیگرتن. چەند جارێك ئەم کردارە دووبارە بووەوە دوای تێپەڕ بوونی کاتی دیاریکراو (ڤۆنت) خوێنی مشکە مەشق پێ کراوەکانی وەرگرت و کردییە ناو لەشی مشکی تر بینرا ئەو مشکانە هەمان ترسی مشکی پێشوویان هەیە ڕەوشتی مەشق پێ کراویان لە ڕێگای خوێنەوە وەرگرتووە. ئەمەش زەنگی گواستنەوەی ڕەوشتە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و زانای سویسری (جیمس ماکونل) هەمان تاقی کردنەوەی گواستنەوەی ڕەوشتی لە ڕێگای خوێنەوە کرد، خوێنی سەگێکی بەردەوام نووستوو خستە ناو لەشی سەگێکی کە خەوی نەبوو بینرا ئەو سەگەی تر پاش چەند جار تاقی کردنەوە بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی دەخەوێت. گرووپێکی سایکۆلۆژیستەکان لەگەڵ گرووپێکی تری زانایانی فەسلەجە دوای وتووێژ و هزر گۆڕینەوە گەیشتنە ئەوە کەوا هەزارەی سێیەم ببێتە پرۆسەی گواستنەوەی دەماغ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بەبێ لەدەست دانی زانستی دەماغ ئەمەش لەسەر بیردۆزی زانای فیزیاویی ئەڵمانی (هیكل جیمك) دا دروست بوو کاتێ دەڵێ ئەگەر هاتو بۆدیی ئۆتۆمۆبێلێك کۆن و ڕووشاوە بوو، بەلاَم مەکینەکەی کارامەیە ئەوا دەتوانین بۆدییەکەی بگۆڕین بۆ ئەوەی درێژترین زەمەن کاربکات....

ئەم بلێسە هزرییە بووە لێکدانەوەی هیرمینۆتیکای پاراسایکۆلۆژیای زانایەکان، بۆنموونە وایان دانا زانایەکی بە توانا لە مێشك و پەککەوتوو لە بەدەن ئەگەر هاتوو بە هۆی نەشتەرگەری، دەماغی ئەو زانایە بگوازرێتەوە بۆ ناو سەری گەنجێکی بە توانا ئایا دەتوانرێت سەر بگرێت و دەماغ ببێتە خاڵی ورووژاندنی هەزارەی سێیەم لە سایکۆلۆژیا، دەتوانرێت لە ڕێگای خوێنەوە ڕەوشتێکی جێگیر بگوازینەوە بۆ کەسێکی تر یان لە ڕێگای گواستنەوەی خانەکانەوە، واتە ئەگەر کەسێك هونەرمەند بوو ئەو سیفەتە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە. چەمکی زاناندنی سەرو هەست (أدراك فوق الحسی) و جوولێنەری دەروون دوو هێزی ناوەکین و پەیوەست نین بە

لێکدانەوەی ماددی، کە پاراسایکۆلۆژیا هیچ سنوورێك بۆ عەقڵ دانانێت، بەلاّم فسیۆلۆژییەکان دەڵێن شوێنێك لە دەماغ هەیە کە شەپۆلە کەهرۆموگناتیسییەکان وەردەگرێت و کاری پێ دەکات و جووڵێنەری دەروونی دروست دەبێت، بەلاّم لە هەزارەی سێیەمدا پێشکەوتنێکی خێرا لە زانستی دەمارو بایۆلۆژیا و کیمیای زیندەگی سەری هەڵدا لە بەرامبەر سیستەمێکی ئاڵۆزی کۆئەندامی ناوەندیی دەمار. زۆر کەم ئەو شوێنانەی دەماغ دیاری کراون کە پێوەندیی بە پرۆسەی پاراسایکۆلۆژییەوە هەیە. چونکە ئاشکرایە دەماغ لە دوو بەشی گەورەی نیوە گۆ پێك هاتووە کە لە شێوەو قەبارە لە یەکتر نزیکن، بەلاّم سایکۆلۆژستەکان و زانایانی دەمار دەڵێن ئەم دوو نیوە گۆیە لە کارو فرمان لەیەکتر جیاوازن لە زۆر لایەنەوە کە تا ئێستا ئەم جیاوازییە بە تەواوەتی نەزانراوە کە زۆر پرسیار دروست دەبێت بۆ دوو نیوە گۆی وەك یەك هەیە،زۆر لە زانایان وای دادەنێن کە بەشێکی وەك یەدەك وایە کلێ نیوە گۆیەکەی تر لەکار کەوت ئەو دەست بەکاردەبێت، بەلاّم لەڕووی ((ئەناتۆمی))یەوە ئەم گریمانە لاواز بوو. بەشی سەروو لە دەماغ ئەو بەشەی کە راستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کەللەی سەر کە پێی دەوترێت مۆخ، بەلاّم ئەگەر کاسەی سەر هەڵبگرێت وەك کاکڵەی گوێز دیارە. بەهۆی وردە دەماری گەیەنراو بەیەکەوە بەستراوەزانراوە کە ئەو کەللەی ڕاستانن ئەوەی لە هەمووئیشەکانیدا دەستی ڕاست بەکاردەهێنێتئەوا نیوەگۆی چەپی دەماغ بنکەی قسەکردنە، بەلاّم نیوەگۆی ڕاست کارێکی کەمتر لە کردارە زمانییەکان دەبینێت. واتە نیوەگۆی چەپی دەماغ مامەڵە لەگەڵ زمان و بیرکردنەوەو ژیربێژی دەکات، بەلاّم نیوەگۆی ڕاست مامەڵە لەگەڵ شێوەکان و هەستەوەرەکان دەکات و..یارمەتیی تاك دەدات بۆ ناسینەوەی دەموچاوی و سیمای خەڵك و شوێنەکان، بەلاّم لای چەپ دەتوانێت هاوکێشەیەکی ماتماتیکی شکار بکات و ستوونێك ژمارە کۆبکاتەوە، دەتوانین بڵێین نیوەی لای چەپ زانا و دانایە، بەلاّم نیوەی لای ڕاست هونەرمەندە. ئەو کەسەی لای چەپی دەماغی تووشی





بەرکەوتن (صدمە) دەبێت ئەوا لاڵ دەبێ یاخود بەگرانی قسە دەکات، بەلاّم دەتوانێت وێنەیەك و هێلکاری بکێشێت.

بەلاّم ئەوکەسەی کە نیوەگۆی ڕاستی دەماغی بەرکەوێت ئەوا ناتوانێت وێنەی دارێك بکێشێت،بەلاّم زۆر مەنتیقی و واقیعی وتاری گفتوگۆ و قسەدەکات، بەلاّم سەیر لەوەدایە ئەگەر تۆرە دەمارە گەیەنراوەی نێوان هەردوو نیوەگۆی تووشی بەرکەوتن بێت ئەوا ئەو کەسە تووشی دووفاقیی کرداری پێچەوانە دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر بەدەستێك لە کەسێك بدات ئەوا بەدەستەکەی تر لەباوەشی دەگرێت و دەرکەوتووە زۆربەی بارە دەروونییەکانی تاك لە بەشی ڕاستی دەماغ دەردەچێت، چونکە لای ڕاستی دەماغ زاڵە بەسەر لای چەپی نیوەگۆی دەماغ و خودی تاك لەبەشی چەپی دەماغ دەبێت. ئەوا ئەو کەسە دەتوانێت سەرکەوتوو بێت و زاناو دانای لێ دەربچێت لە بواری خۆیدا سەرکەوتوو دەبێت، وەك (ئەنشتاین، پاڤلۆڤ، هۆرنی، مەکارتی و ئەدلەر.....) بەلاّم ئەگەر خودی تاك لەبەشی ڕاستی نیوەگۆی دەماغ سەری هەڵدا ئەوا کەسێکی ڕەفتار نامۆ دەبێت (غريب الأطوار) وەك (خرۆشۆف، فرۆید، ستالین، کۆلن ولسن....) تەنانەت لە بۆچوون و کردارەکانیان شتی سەیرو سەمەرەیان تێدایە.جگە لەوەی کە دەماغ دوو بەشی جیاوازن لە پێکهاتە،ئەوا لە زۆربەی پرۆسەی کرداری بیرکردنەوەو بیرهاتنەوەو داهێنان هاوبەشیی یەکتر دەکەن،بەلاّم بەشی ڕاستی دەماغ لە کردارەکانیدا بەشێکی شیکراوە نییە،کە زۆربەی پرۆسەی زاناندنی سەروو هەست لەو بەشە ڕوودەدات و پاراسایکۆلۆژیستەکان دەڵێن زاناندنی (ادراك) سەروو هەست و جووڵێنەری دەروونی بەرهەمی توانای کارەبایی – کیمیایی دەماغە، لە دەماغی مرۆڤدا دەتوانرێت بە هۆی (ڕەجەی-کارەباوە بیرهاتنەوەو بیرچوونەوە کۆنترۆڵ بکەین و بەشێك لە دەماغ لەکار بخەین، بەلاّم ماددەی کیمیایی و پێکهاتەکانی، ئەوا دەتوانێت بەشێك لە دەماغ لەکار بخەین و بەشێکی تر چالاك بکەین هەموو چالاکییەکانی دەماغ کۆنترۆڵ بکەین هەندێك کار ئەنجام بدات کە بە ئیرادەی (ویستی) خۆی نییە. واتە لەژێر

کارە خودییەکان ڕزگار دەبێت و وەك مرۆڤێکی ئامێری هەڵسوکەوت دەکات. لە هەزارەی سێیەمدا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای بایەلۆژی و کیمیایی و پزیشکی توانراوە دەست بەسەر عەقڵی مرۆڤدا بگیرێت وەك مرۆڤی ڕۆبۆتی لێ بێت.کە هەرچی داوای لێ بکرێت کارەکە ئەنجام بدات کە هیچ شتێکیان بیرنایەتەوە، تووشی نەخۆشیی (ئەمینزیا) دەبن.لە ساڵانی زووەوە بەهۆی گەشەسەندنی پاراسایکۆلۆژیا و دۆزینەوەی چەندین پێکهاتەی کیمیایی و بایۆلۆژی پاراسایکۆلۆژیا وەك زانستێکی ئاڵۆزو بەردەوام مایەوە تا کۆتایی هەزارەی دووەم کە چەندین پێکهاتەی دەرمان دۆزرایەوە کەوا چالاکیی مێشك زیاد دەکات. یەکێك لەوانە پێکهاتەی (LSD)ە کە زانای سویسری ((ئەلبرت هۆفمان)) دۆزییەوە کاتێ یەکێ لە خوێیەکانی ئامادە دەکرد ماددەیەکی زۆر سەیری دۆزییەوە، لەکاتی خواردنیدا ڕاستەوخۆ تووشی خەیاڵی سەیرو نامەعقوول دەبوو، لەگەڵ سەرسووڕان و چێژێکی سەرخۆشی. کە یەك گرام دەتوانرێت (١٠٠٠٠) ((جرعە)) لێ دروست بکرێت و هەر جورعەیەك دەتوانێت عەقڵی مرۆڤێك کۆنترۆڵ بکات، بەلام پێکهاتەیەکی تر دۆزرایەوە (BZ) کە (دە) جار بەهێزترە لە پێکهاتەی (LSD) کە هەموو شتێك لە مێشك ڕەشی دەکاتەوەو ماددەیەکی درێژ کاریگەریی بەسەر مێشکی مرۆڤەوە دەمێنێت. تاکیش هەر کردەوەیەك لە نائاگاوە دەیکات کۆنترۆڵی نامێنێت. بۆ نموونە کاتێ یەك جورعە لە پێکهاتەی (LSD) بەهۆی قاوەوە دەرخواردی (د. ئەلسون) درا یەکسەر خۆی لە پەنجەرەی ئاپارتمانی (٢٠) نهۆمییەوە فڕێ داو مرد بێ ئەوەی ئاگاداری ئەم کارەی خۆی بێت.ئەمەش پیلانێکی داڕێژراو بوو لەلایەن سیخوڕەکانی ئەمەریکاوە بۆ لەناوبردنی چەپەکانی ئەو وڵاتە کە بە کارەساتی خۆکوشتن لەقەڵەم درا. بەکارهێنانی بەشێکی دەماغی تاك و کۆنترۆڵ کردنی لە دوورییەکی دیاریکراوداو بەرنامە دانانی بە پێی بەرژەوەندییە دیاریکراوەکان، یەکێکە لە توێژینەوە هەرە گرینگەکانی هەزارەی سێیەم بۆ پاراسایکۆلۆژی کە لە زۆر بواری هەواڵگری و ڕامیاریی سیخوڕی و تەکنەلۆژیی بەکارهێنراوە تەنانەت ئەم دەرمانە بۆ کۆنترۆڵ





کردنی عەقڵی یەکێك بۆ کوشتنی (جۆن کەنەدی) بەکارهێنراوە. هەر لە کۆنەوە لە سەردەمی فیرعۆنییەکاندا هەوڵی ئەوە دراوە کۆنترۆڵی عەقڵ و ڕەوشت بکرێت، ئەویش لە ڕێگای جادوو و سیحرو بۆن و بخوورەوە توانراوە لە ڕێگای ئەمانەو لە ڕێگای سرووتەوە ئەم کارە بکەن بەناوی دەرکردنی ئایتمی شەڕانگێزی و شەیتان. ئەم کردارانە بەردەوام بووە، جۆرەها تاقی کردنەوەی سایکۆلۆژی لەسەر کراوە تا سەردەمی ((پاڤلۆڤ)) کە بەشێوەیەکی زانستی – فەسلەجی لە سەرەتای هەزارەی دووەمدا سەدان تاقیکردنەوەی کرد لەسەر کۆنترۆڵ کردنی ڕەوشت و ئاراستەکردنی کردارە ڕاوشتییەکان بە پێی ورووژاندنی دەرەکی (دەستکرد). ((پاڤلۆڤ)) ئەوەی سەلماند کە هەوکێشەیەك لە ڕەوشتی مرۆڤدا هاوتایە، دەتوانرێت لە کاتی (فاین- Fine) دا پەیڕەو بکرێت:

ورووژاندن ← وەڵام دانەوە ← گۆڕانی ڕەوشت.

پێچەوانەیان هاوتا لەگەڵ ورووژاندندا دەبێت. ((پاڤلۆڤ)) کاتێك ئەم شاکارە زانستییەی ئەنجام دا جیهان بەرەو دوو جەمسەرگیری لە گۆڕاندابوو. گەورەترین کاری لەم کاتەدا تاقی کردنەوەی شوشتنەوەی مێشك بوو لەگەڵ بەتاڵ کردن و گەڕاندنەوەی بیرهاتنەوەی لە مێشك. ئەم تاقی کردنەوانەی ((پاڤلۆڤ)) بووە سەرەتای توێژینەوەی زانستی بەرامبەر کۆنترۆڵ کردنی ڕەوشتی مرۆڤ و ئاراستەکردنی بەپێی بەرژەوەندی دیاریکراو.

**پەراوێز:**

(LSD): هێمایەکە بۆ پێکهاتەیەکی کیمیایی کاریگەر، گۆڕانکارییەکی گەورە لە ڕەوشتی مرۆڤ دەکات، بەهێزیی ئەو پێکهاتەیە لەوەدایە کەوا یەکسەر ناوەندی دەماغی خواروو کۆنترۆڵ دەکات و دەیخاتە نائاگاوە، زۆر لە توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە شوێنی ئازارو چێژ لە توێکڵی مێشك و پالموس (Thalamus) ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو پێکهاتەیە.سایکۆلۆژیستەکان ئەوەیان دەرخستووە کە وەرگرتنی بڕێکی کەم لەو

پێکهاتەیە، تاك دەچێتە باری نائاگایی و هیلاوس کردن، لە نائاگاوە زۆر کردەوە دەکات. لەوانەیە حاڵەتی داهێنان لەو کردارە ڕووبدات، چونکە ئەو کاتە هونەرمەند هەست دەکات بۆنی مۆسیقا دەکات و گوێبیستی ڕەنگەکان دەبێت و ئاگر ساردەو زۆر کەس دەبینێت و دەنگی گوێ لێ دەبێ کە لە واقیعدا بوونیان نییە، لە خودی خۆی نامۆ دەبێت و زۆربەی هونەرمەندەکانی شێوەکار لە ئەمەریکاو ئەوروپا ئەو پێکهاتەیە بۆ حاڵەتی داهێنان و دیلۆگ دروست کردن لەگەڵ ڕەنگ و هێڵەکان بەکاردەهێنن.

## سەرچاوەکان

١-سلمان يعقوب-ظواهر ثاراسايكولوجية- علوم- عدد(١٠٤)/١٩٩٩.
٢-قاسم حسين صالح-الابداع في الفن-دار الرشيد/بغداد/١٩٨١.

١١٧

# زانستە سیخوڕییەکانی پاڤلۆڤ

(شۆڕشت رزگار کرد، ئەو تۆژینەوە زانستییانەی تۆ ئەنجامت دا بیمەی دەوڵەتی ئایندە ڕۆژی کۆمەنستی-یە...). دیوارەکانی کرملین لەم شەوە ساردە گەرم بووەوە بەو دیالۆگەی نێوان لینین و پاڤلۆڤ. کاربەدەستانی ئەوسای سۆڤیەت هەوڵی ئەوەیان دا ئەو تاقی کردنەوەیەی کە لەسەر گیانەوەر کراوە بۆ گۆڕانکاریی ڕەوشتی گیانەوەر بەهەمان شێوە لەسەر مرۆڤ بکرێت و سوودمەند بێت بۆ گۆڕانکاریی ڕەوشتی دیاریکراویان ویستیان سوود لەم تاقیکردنەوەیە وەرگرن بۆ لەناو بردنی ڕەوشتێکی دیاریکراوو جێگیر کردنی ڕەوشتێکی مەبەستدار. لە وتەکانی پاڤلۆڤ دەرکەوت کەوا ئەو تۆژینەوەیەی کردووە لەسەر پەرچەکردارو خۆپاراستنی خود، بەختەوەرییەکی بێ سنوورە بۆ پاشەڕۆژی مرۆڤ. لەو سەردەمەدا تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەموو



پەرچەکردارە ڕەوشتییەکان و ئایدیۆلۆژییەکان و شوشتنەوەی مێشك و کارە سیخوڕییەکان و ملکەچ بوونی ڕەوشت و جەنگی دەروونی و...لەسەر تیۆریی تۆژینەوەکانی پاڤلۆڤ بەڕێوە دەچێ و لەسەر تاسەری جیهاندا لەژێر ڕۆشنایی نووسینەکانی پاڤلۆڤ دەزگای هەواڵگری و سیخوڕییەکاندروست دەکرێت. خاڵی سەرەکی لە بیردۆزی پاڤلۆڤ دروست کردنی دڵەڕاوکێیە (قلق) کە بنچینەی وروژاندن و وەڵامدانەوەیە، واتە کاتێك وروژاندنێکی دەرەکی یان ناوەکی هەبێت ئەوا گۆڕانێکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لە ڕەوشتی مرۆڤ ڕوو دەدات و نا ئارامگیری دروست دەبێت مرۆڤ تووشی باری دڵەڕاوکێ دەبێ، ئەو کاتە بەدوای ڕەوشتێکی گونجاوی کاتی دەگەڕێت ئەمەش بەهۆی وەڵامدانەوە بۆ وروژاندنەکە دەبێت

وروژاندن ←—— دروست بوونی دڵەڕاوکێ ←—— وەڵامدانەوە بەهۆی دروست بوونی ڕەوشتی تازە.

پاڤلۆڤ کاتێك سەگێکی هێنا لە ژووری تاقیکردنەوەی دانا بەهۆی چەند جەمسەرێکی کارەباوە لیکە ڕژێنەکان و گۆڕانی شەپۆلی مێشك ئاگادار بوو. کاتێ دەستیکرد بە تاقی کردنەوە هەموو وروژاندنە دەرەکییەکانی بڕی لە دەوروبەرو گڵۆپێکی سوور یان زەنگی کارەبای دانا هەرکاتێ خواردنی بۆ دەهێنا بەچەند چرکەیەك پێشوەختە گڵۆپی سوور پێ دەبوو یان زەنگ لێ دەدرا ئەو کاتە خواردنەکە دەهات، چەند جارێك ئەو تاقیکردنەوەیە دووبارە کرایەوە تا سەگەکە لەوە ڕاهات یاخود ڕەوشتێکی نوێی وەرگرت و ئەویش بەیەکەوە بەستنی دوو فاکتەری لێك جیاواز گڵۆپی سوورو هاتنی خواردن لەگەڵ ڕژانی لیکی دەمی سەگەکە. چونکە هەرکاتێ گڵۆپی سوور پێ دەبوو سەگەکە دەیزانی خواردن دێت بەر لەوەی خواردن دیاربێت یەکسەر لیك لەناو دەمی دەڕژاو شەپۆلەکانی مێشك جووڵەیان دەگۆڕا کە دەبووە گۆڕانی ڕەوشتی تاك ئەمەش بە دووبارە کردنەوەی کردارەکەخاڵی زانستی لەم پێوەندییە ئەوەیە دروست کردنی دڵەڕاوکێیە لەو زەمەنەی نێوان داگیرساندنی گڵۆپی سوورو هاتنی خواردن واتە گۆڕانکاریی

فەسلەجی.پاڤلۆڤ دەڵێ هەر کاتێ هەورو باران بێت بروسکەمان بیر دەکەوێتەوە، دەکەوینە حاڵەتی ترس،منداڵ هیچ کاتێك لە پزیشك ناترسێ بەلاَم کاتێ دەرزی لێ دەدات و ئازاری پێ دەگات ئەوا هەرکاتێ پزیشك ببینێ یان ناوی ببیستێ دەترسێ چونکەئازاری بیردەکەوێتەوە هەر کاتێ زەنگی ئاگادار کردنەوەمان گوێ لێبێت فڕۆکەو بۆمبابارانمان بیر دەکەوێتەوە. ئەوەی پاڤلۆڤ کردی بەیەك بەستنەوەی دوو فاکتەری دەرەکی ژینگە بۆ گۆڕانی فەسلەجیی مرۆڤ و وەدەست هێنانی ڕەوشتێکی نوێ لە شوێنی ڕەوشتی کۆن بوو.

گڵۆپی سوور + خواردن ⟵ وەلاَم دانەوە (ڕژانی لیك)

وروژاندنی سروشتی (باران)+ وروژاندنی مەرجی (بروسك) ⟵ وەلاَم دانەوە (ترس)ئەم کردارەی پاڤلۆڤ بۆ زۆربەی گیانەوەرانی سێرك بەکاردێت بە ئازاردان کە لەگەڵ فاکتەرێکی دەرەکیی گرێ دەدەن، ئەوا ئەو ئاژەڵە فرمانەکان جێبەجێ دەکاتئەو گیانەوەرە دەخەنە سەر پارچە پلێتێکی گەرم و مۆسیقای تایبەتی بۆ لێ دەدەن گیانەوەرەکە لە تاو ئازاری سەماَ دەکات و چەند جارێك ئەم تاقی کردنەوەیە دووبارە دەکەنەوە تاڕادەی وەرگرتنی ڕەوشتی تازە دوای ئەوە گیانەوەرەکە بە بیستنی ئەم مۆسیقا تایبەتییە یەکسەر ئازارەکەی بیردەکەوێتەوە و دەکەوێتە سەما کردن بەلاَم سایکۆلۆجستەکان دەڵێن،کاتێ گڵۆپی سوور پێدەبێت و خواردن نایەت ئەو کاتە سەگەکە پلەی دڵەڕاوکێی زۆر بەرز دەبێتەوە جووڵانەوەو ڕەوشتی نائاسایی دەبێت، ئەگەر خواردن هات ئەو کاتە دڵە ڕاوکێی کەم دەبێت و ئاسایی دەبێتەوە،بەلاَم ئەگەر خواردن نەهات واتە پێوەندیی لەنێوان وروژاندنی مەرجی (گڵۆپی سوور) وورووژاندنی سروشتی (خواردن)لاواز بوو ئەوا سەگەکە تووشی کوژانەوەی هەڵچوونەکان دەبێت و دەکەوێتە بارێکی تێکچوونی ڕەوشتی ڕەنگە ئەگەر ئامادەیی دەروونی و فەسلەجی نەبێت و بەتوانا نەبێت بەهۆی چاوەڕوانی کردن تووشی دارِمان و لاوازیی ڕەوشتی ببێت. واتە ئەگەر کەسێك لە کات و شوێنی



دیاریکراودا وتی دێم و نەهات چەند جارێك ئەم کردارەی دووبارە کردەوە ئەوا باوەڕی و پەیمان نامێنێت و باوەڕی خۆت بەرامبەری دەگۆڕی(١).




ئەمانە هەمووی تاقی کردنەوەی پاڤلۆڤ بوو لەسەر گۆڕانی فەسلەجی گیانەوەر بە بەهێزکردن و لاوازکردنی هەردوو وروژاندنی سروشتی و مەرجی و کاریگەری بەسەر گۆڕانی ڕەوشتی گیانەوەران..بەلاَم کار بەوە نەوەستا هێزی دەروونزانی لە بەرەودابوو کاتێك ((ڤلادیمیر لینین)) لە کۆشکی سوور داوای لە پاڤلۆڤ کرد ئەوەی لەسەر گیانەوەران کردوویەتی ئیتر بەسە کاتی ئەوە هاتووە لەسەر مرۆڤ تاقی بکرێتەوەو ڕاستییەکانی فەسلەجەی گۆڕانی ڕەوشتی مرۆڤ کۆنترۆڵ بکرێت. بۆ پێیداکردنیسیخوڕو لایەنگرو ڕەش کردنەوەی بیرو باوەڕێك و دانانی بیروباوەڕێکی تازەو خۆ بەدەستەوەدانی (استسلام)سیاسی و حزبی و گۆڕانی هەڵوێست بە پێی بیردۆزی پاڤلۆڤ:

وروووژاندنی مەرجی + پاڵەپەستۆو ترساندن و تۆقاندن ⟵ گۆڕان و کۆنترۆڵ کردنی ڕەوشت.

کتێك بەندێك لە ژوورێك دادەنرێت بە تەنیا هەرکاتێ بۆ ئازاردان دەیبەن گڵۆپێکی سوور لە ژوورەکە دادەگیرسێنن یان دەنگی تەپەی پێ دێت کاتێ جەلادەکان وەژوور

دەکەون ڕاپێچی دەکەن و سزای دەدەن، چەند جارێك ئەو کردارە دووبارە دەکەنەوە تا بەندکراوەکە پێوەندی لە نێوان گڵۆپی سوورو یان تەپەی پێ لەگەڵ هاتنی جەلادەکان پەیدا دەکات، بەلام کاتێ گڵۆپی سوور یان تەپەی پێی جەلادەکان دێت، بەلام جەلادەکان نایەنە ژووریٚ و بەندەکە ڕاپێچ بکەن ئەوا هەر لە چاوەڕوانیدا دەژیت و کێرڤی دڵەڕاوکێ لەوپەڕی بەرزیدا دەبێت و جووڵانەوەی ڕەوشتی نائاسایی دەبێت تا ڕادەی دارمان و وره ڕووخان ئەوکاتەی دوژمن تەئکید دەکات کەوا بەندراوەکە بەتەواوەتی ئامادەیی خۆ بەدەستەوەدانی هەیە،؟ دەست دەکەن بە قۆناغی بەتاڵ کردنەوەی مێشك بەهۆی هۆکاری هاندەری دەروونی(٢).

بۆ چەند کاتێك بە پێی توانای بەندکراوەکە، دوای ئەوە دەست دەکەن بە قۆناغی دووەم کە دووبارە کردنەوەی زانیاری و ڕۆشنبیری دژە ئیرادەیە، یان پڕکردنەوەی مێشکی بەندکراوەکە بەهۆی پرۆپاگەندەی خۆیان یان بەندکراوەکە بۆ ماوەیەکی




زۆر هەراسان دەکرێت لە بەرامبەر خەو یا برسی کردن، یان دەخرێتە ژوورێکی لوولەیی و لەسەرەوە دڵۆپ دڵۆپ ئاو دەکەوێتە ناوەڕاستی سەری تا بەتەواوەتی هەموو بیروباوەڕێکی تێك دەدات و دەڕوخێ، ئەوکات دەکەوێتە ژێر فەرمانی ئەوان.





دروست کردنی دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانیی خاڵی سەرەکیی بزوێنەری تەوەری زانستی پاڤلۆڤە، چونکە هەر چەند کاتی چاوەڕوانی زیاد بێت دڵەڕاوکێ زیاد دەبێت و لەگەڵ زیاد بوونی دڵەڕاوکێ خێرایی لێدانی دڵ بەشێوەیەکی نارێك زیاد دەبێت لەگەڵبەرز بوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن زۆرجار دەبێتە هۆی ڕەق بوونەوەو مردن یان هیستریای توند بەتایبەتی بەند کراوەکان و دەبێتە هۆی تێك چوونی فرمانی یەکەی ناوەندی مێشك و تێکچوونی دەمارەکان و گەدەو ڕیخۆڵەو لەبیرچوونەوەو ترسێکی نائاگایی زۆر. ئەمانە هەموو لە ژێر ڕۆشنایی تیۆری پاڤلۆڤ بەکار هاتووە بە تایبەتی لەکاتی شەڕوشەڕی دەروونی بۆ ئیعتیراف کردن وئاشکرا کردنی نهێنییەکانی سیاسی و دروست کردنی سیخوڕی و کارکردن لە دژە سەنگەر هەروەك لەشەڕە ساردەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرامبەر گیانەوەرەکانیش بەکار هاتووە، بەتایبەتی برسی کردن، وەکو (زەکەریا تامر) لە چیرۆکی ((پڵنگەکان لە ڕۆژی دەیەمدا)) باس دەکات کە بەپێی بیردۆزی ورووژاندنی مەرجی پاڤلۆڤ بەکارهاتووە، کە پڵنگەکە لە ڕۆژی یەکەم ملکەچی فەرمانی ڕاوچی نابێت ئازایەتی و پڵنگایەتیی خۆی دەسەلمێنێ بەلام بەهۆی برسی کردن ڕۆژ بە ڕۆژ پڵنگەکە هیلاك دەبێ و ملکەچی فەرمانی ڕاوچی دەبێت تا ڕۆژی دەیەم داوای لێ دەکرێت وەکو گوێدرێژ بزەڕێ و واز لە پڵنگایەتی و ئازایەتیی خۆی دەهێنێ و وەکو گوێدرێژ دەزەڕێ و ڕەوشتی نوێ وەردەگرێ لەبەرامبەر برسیەتی چۆك دادەدات. ئەو کاتە ڕاوچی دەگاتە مەرامی خۆی و لەفەز دەری دەهێنێ دەڵێ مادام وەکو گوێدرێژ دەزەڕی جێگات دەرەوەیە نەك ناو قەفەس. واتە ئەو کەسانەی بیرو باوەڕ و هەڵوێست لەناو گەدەو ورگی خۆیان دەهاڕن لە گەدەوە بیردەکەنەوە، مێشکیان لە ورگیاندایە لە شۆڕشگێڕیدا دەرشێنەوە ئەوا واز لە ڕێچکەو بیرو باوەڕی خۆی دەهێنێ و هەموو دەم ئامادەیە بۆ ملکەچ بوون بەرامبەر بە تێرکردنی هەندێ لە غەریزە فەسلەجییەکانی و یان بەرامبەر بە هەندێ خۆشنوودی (أمتیازات) کە بەردەوام ڕووخاون هەڵوێستێکی تێك شکاویان هەیە پاڤلۆڤ میکانیکی فەسلەجە دەکاتە

بنچینەی گۆڕانی ڕەوشتەکان واتە هەموو ورووژاندنێکی دەرەکی (مەرجی) وەلاّم دانەوەیەکی ناوەوەی لەگەڵدا دەبێت و بە پێی گۆڕانکارییە فەسلەجییەکان ڕەوشتە تازەکە دیاری دەکرێت.مرۆڤلە کۆمەڵێك سیستەمی وەلاّمدانەوە بە ورووژێنەرەکانی دەوروبەر پێك هاتووە گەلێ جار بەهۆی ورووژاندنی غەریزەکان ڕەوشتێکی مەرجی دوەکی دروست دەبێت واتە بەدەستکاری کردنی ئەو کۆمەڵە سیستەمە بەهۆی جۆری ورووژاندن دەتوانین ڕەوشتە وەلاّم دراوەکان کۆنترۆڵ بکرێت لە جیاتی دەرمانی بێ هۆشی و فشاری بەدەنی دەتوانین فشاری فەسلەجی- دەروونی بخەینە سەر کەسی بەکار هێنراو کە لە نائاگاوە جیهانێکی وەهمی دروست بکەین هەرکاتێ ورووژاندن ڕەوانەی ئەو بەشە بکەین ئەوا وەلاّم دانەوەکە لە نائاگاوە دەچێتە ئاگا (شعور)،کەسە بەکار هێنراوەکە بەپێی چەند دسپلینێکی دەست نیشانکراو کار دەکات واتە بەهۆی ورووژاندن- وەلاّمدانەوە دەتوانین تۆڕێکی سیخوڕی لە هەندێك کەس دروست بکەین تەنیا بەناردنی هێمایەکانی ورووژاندن. نموونە، کاتێك ئاژەڵی سێرك یاری دەکات بە بەرچاوی خەڵك هیچ پلێتێکی گەرم نییە بەلاّم بەهۆی مۆسیقاوە یان هێمایەکی دیاریکراو یان نیشانە ئەوا لە نائاگاوە ئازاری بیر دەکەوێتەوە دەکەوێتە حاڵەتی کۆنترۆڵ کردن وەکو مارانگاز لە خشەی گوریس دەترسێ یان منداڵ بەهۆی بیرهاتنەوەی ئازاری دەرزی لە نەخۆشخانەو پزیشك دەترسێ یان پزیشك دەبێتە سەرچاوەی ورووژاندنی هەڕەشەکردن و چاوسوورکردنەوەو سەرکۆنەکردن بۆ ئەوەی منداڵەکە لە ژێر فەرمان بێت.

لای پاڤلۆڤ خەو بەگەورەترین هێزی نائاگایی دادەنرێت کاتێك ئەو هێزە تێك دەشکێنرێت ئەوا نائاگا ئامادە دەبێت بۆ پەیڕەو کردنی فەرمانەکانی ورووژاندنی دەرەوە،واتە هەڵڕشتنی هەموو زانیارییە شاراوەکانی نائاگا بەهۆی ئەم تێکشکاندنە بۆیە زۆربەی کارە سیخوڕییەکان بۆ ملکەچ کردنی بەندییەکان تەرکیز دەکەنە سەر خاڵی خەو،هەراسان کردنی بەندکراوەکە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەوا ئەو کەسە لە ئاگاوە دەچێتە باری سڕبوون و لە نائاگاوە ئامادە دەبێت بۆ وەلاّم دانەوەو ئیعتراف



کردن بەهەموو کردەوەکانی ڕابردوو،ئاگا لە کۆنترۆڵ کردن دەردەچێت و نائاگای تاك بەکاردەهێنرێت بەهۆی وەلاّم دانەوە لە نائاگاوە بۆ هەموو ورووژاندنێك لە ئاگاوە بۆیە بەپێی تیۆریی پاڤلۆڤ هەمیشە بەندییەکان دەخرێنە ژوورێك لە ژێر چاودێریدا دەبن لەکاتی خەوتندا بەدەنگی بەرزو تەقە هەراسانیان دەکەن ئەو کاتە دەکەونە حاڵەتی گرژیدەمارو تێکچوونی ئاگایی و دارمان بەرامبەر هێزی دەرەکی.
خەو لای پاڤلۆڤ بریتییە لەکاری وەستانی چالاکی توێکلّی مێشك لە دواییدا وەستانی ئەم چالاکییە تەشەنە دەکات تا دەماغ دەگرێتەوە لە دواییدا کۆئەندامی دەمارو بەهەموو ئەندامەکانی لەش بلاّو دەبێتەوەو دەکەوێتە باری خاوبوونەوە و ئەم وەستانەش بۆ کاتێکی دیاریکراو دەبێ و...کاری وەستانی چالاکی کارێکی ئاساییە لە کاتی نووستندا.لەکاتی نووستندا ورووژاندن ناوچەکانی مێشك و هەموو شوێنەکانی دەماغ دەگرێتەوە لەگەڵ دڕکە پەتك.خەو لای پاڤلۆڤ بریتییە لە بنچینەیەکی فەسلەجی و کارێکی وەستانی چالاکیی ناوەوەو... تێبینی ئەوە کراوە هەندێ خانەی مۆخ بە ئاگاداری دەمێنێتەوە لە کاتی خەوتندا و پاڤلۆڤ ناوی ناوە ناوچەی پاسەوانەکان ئەمەش وا دەکات نووستوو پێوەندی بکات لەگەڵ دەوروبەردا وەك ﴿خۆجوولاّندنەوە، هەست کردنبەسەرماو گەرما....﴾ بە پێی تۆژینەوەی پاڤلۆڤ لەسەر بارە فسیۆلۆجییەکانی مێشك دوو گرووپی هێمایی هەستەوەرەکان هەیە کە گرووپی یەکەم پێی دەوترێت نیشانەی هێماکاری یەکەم کە بە پێنج هەستەوەرە دەرەکییەکان ناسراون،دەتوانرێت لە کەمترین کاتدا وەلاّمی ورووژاندنی دەرەکی بەنەوە بەپێی تاوگیریی ورووژاندنەکە و کات و شوێن کە بەشێکی دانەبڕاوە لە هاوسەنگی تاك لەگەڵ دەوروبەردا،بەلاّم گرووپەکەی تر پێی دەوترێت کۆمەڵەی نیشانەی هێماکاری دووەم کە دیوی ناوەوەی پێنج هەستەوەرەکانن لە نائاگاوە واتە لە عەقڵی ناوەوە.

بینین دوو جۆرە،بینیی شتی واقیعی دەوروبەرو حەکم کردن و هەڵسەنگاندنی لەبەرامبەر میکانیکی مێشك، بەلاّم بینینی نائاگا واتە وێناکردنی هزری مێشك

(تصورات)یان بینینی دیمەنێکی خەون ئەو وێناکردنە هزرییە تەواوکەری دیوی ڕاستەقینەی هەستی بینینە و هەروەها هەر پێنج هەستەوەرەکەی تر کاتێك وروژاندنێکی دەرەکی ڕەوانە دەکرێت بۆ گرووپی هێماکاری دووەم لە نائاگاوە ئەوا دەتوانرێت وەڵامی شاراوە بدرێتەوە بە پێی جۆری وروژاندنەکە بەبێ ڕتووش و ڕووپۆشی و وەڵامدانەوەی هەستەوەری ئاگاکان واتە دەتوانرێت هەموو زانیارییەکی ڕاستەقینە لە بەندییەکان وەربگرێت بەتایبەتی زانیاریی سەربازی و ڕێکخستنی نهێنی، بێ ئەوەی تاك بتوانێت کۆنترۆڵی وەڵامدانەوەی خۆی بکات، چونکە ئەو کاتە عەقڵی ناوەوە بەهۆی کۆمەڵە نیشانەی هێماکاری دووەم دیالۆگی ئاشکرا دەکات لەگەڵ ئەو کەسەی کە وروژاندن ڕەوانە دەکات ئەمەش بۆ گرتنی سیخوڕەکان و دروست کردنی تابوور دەبێت...

## پەراوێز

*ئیڤان بیترۆفتش پاڤلۆڤ ساڵی ((١٨٤٩)) لە گوندێکی ڕووسیا لە دایك بووە باوکی ڕاهیب بووە لە سەردەمی قەیسەرەکان و دایکی دوای نۆ منداڵ کۆچی دوایی کردووە.لە سەرەتای منداڵیدا سەرەتایەکانی خوێندن و نووسین و کشتوکاڵی لەسەر دەستی ئافرەتێکی بە ساڵاچوو فێربووە، لە تەمەنی (١١) ساڵیدا چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی.((١٨٧٠)) چووەتە زانکۆی ((سانت پێترسبۆرگ)) لە بەشی زانیاریی سروشتی وەرگیراوە فەسلەجەی گیانەوەری هەڵبژارد وەك خوێندنی زانکۆ ساڵی ((١٨٧٥)) زانکۆی تەواو کرد و هەر لە هەمان زانکۆ بووە یاریدەدەری پرۆفیسۆر((تیسون)). دوای ئەوە پێوەندیی کرد بە ئەکادیمیای پزیشکی سەربازی و ساڵی((١٨٧٩)) تەواوی کرد و کاری پزیشکی دەست پێکرد. نامەی دکتۆرای لە پزیشکی ساڵی ((١٨٨٣)) تەواو کرد لە ((١٨٨٤-١٨٨٦)) دوو ساڵ لە زانکۆیەکانی ئەڵمانیا دەرسی وتەوە، ((١٩٠٣))لە کۆنگرەی زانستی لە مەدرید بەشداریی کرد یەکەم وانەی دەربارەی پەرچە کرداری مەرجی پێشکەش کرد. کە لە ساڵی ((١٩٠٤))دا خەڵاتی نۆبڵی پێبەخشراو





یەکەم زانا و لێکۆڵەرەوەی زانستی ڕووسیا بوو، کە ئەم خەڵاتە وەرگرێت. ساڵی((١٩١٧)) باوەڕی بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر نەبوو، بەڵام ژیانی زۆر باشتر بوو.

((١٩٢١))گەورەترین خەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتی لەسەر دەستی ((لینین)) وەرگرت ئەوکاتە کتێبێکی (٤٠٠)لاپەڕەیی لەسەر چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی وروژاندنی مەرجی لەسەر مرۆڤ و تەواوی تاقیکردنەوەی لەسەر گیانەوەران باس کردبوو.

((١٩٢٥)) وانەبێژبوو لە زانکۆی ((سۆربۆن)) لە فەرەنسا و ساڵی ((١٩٢٩)) لە کۆنگرەی سێزدەیەمی نێودەوڵەتی بۆ فەسلەجە لە (بۆستن) بەشداربوو((١٩٣٣)) هەندێك لە زانایانی سۆڤیەت سکالایان پێشکەش بە دەوڵەت کرد دژی پاڤلۆڤ کەوا ئازاری گیانەوەران دەدات کە بووە هۆی دادگایی کردنی چوار مانگ. لە تەمەنی (٨٧) ساڵیشدا ساڵی ((١٩٣٦)) بۆ یەکجارەکی لە تاقیگەی خۆی چاوی لێك نا. دوای خۆی (٨٣١) تۆژینەوەی زانستی فەسلەجە و کۆئەندامی دەمارو خەو و پەرچەکرداری بەجێ هێشت لەگەڵ (٣١) کتێبی بەنرخ.

پاڤلۆڤ لە ڕووی تۆژینەوەی فەسلەجی دەمارو هەستەوەرەکان و گۆڕانی ڕەوشت و فێربوون بە گەورەترین زانای سەدەی بیستەم دادەنرێت و لە ژیانیدا جگە لە خەڵاتی نۆبڵ (٢٨) خەڵاتی زانستیی وەرگرتووە.

## سەرچاوەکان

١-صلاح نصر –الحرب النفسية-القاهرة-الطبعة الثانية-١٩٦٧.
٢-د. أحمد فائق، د. محمود عبدالقادر. مدخل الى علم النفس العام-المكتبة الأنجلو مصرية ١٩٥٣ .
٣-د. نوري جعفر –طبيعة الانسان في ضوء فسلجة بافلوف-جزء (١-٢) مكتبة التحرير بغداد ١٩٥٨.
٤-قاسم حسين صالح- الانسان..من هو؟ دار الشؤون الثقافية- بغداد- ١٩٨٦.
٥-صباح حنا، يوسف حنا ابراهيم- علم النفسالتكويني- جامعة الموصل-١٩٨٨.

تێبینی:

فەسلەجە یان فەسلەجی= فیزیۆلۆژی.گیانەوەر= الحیوان. ئاژەڵ= الماشیە.

# خودەسانسۆر و دەروونزانیی تاك

تەنگەژەکانی ((ئەبرەهام ماسلۆ)) لەو کاتە سەردەگرێت کاتێك خودی ((ماسلۆ)) سەرگەردانی پێداویستەکانی تاك دەبێت، تاك وەکو کۆمەڵێك پێداویستی لێك دانەبڕاو سەیر دەکات،هەموو مرۆڤێك و گیانەوەرێك تا پێداویستە بنەڕەتییەکانی تێر نەکرێت، هەستەوەرەکانی پەیوەست نابن بەدەوروبەر.

((ماسلۆ)) وەکو ئەنتی مارکسیزم کارناکات لە دەروونزانی-دا، بەلاَم بیردۆزی پێداویستی تاك دابڕانێکە لە وەهمی بەرژەوەندییە گشتگیرییەکان، هەموو شتێك لە پێداویستی فەسلەجەکان-ەوە دەست پێدەکات، ڕەوشتی تاك لەگەڵ کێرڤی تێربوون و تێرنەبوونی پێداویستەکان دەگۆڕێت، پێداویستی ناوەوە درێژە پێدان و سەرهەڵدانی پێداویستەکانی دەوروبەرو هاوسەنگ بوونە لەگەڵ ژینگەو کۆمەڵ (خواردن، نووستن، مردن، سێکس، سکون بوونی جەستە...) وەکو پێداویستی بنەڕەتی لە تاکدا کار دەکەن ئەمرۆ هەموو تیۆرییە ئەپستمۆلۆژییەکانی مرۆڤ، تاك جەدەلی لەسەر ناکات و ناچێتە ناو باسە فەسلەجییەکانی، بەلاَم (هاوسەنگی، ئارامگیری، خۆشەویستی و ڕێزگرتن، پایەی کۆمەلاَیەتی، ئابووری، بیمەی خودی تاك، پرۆژەکانی خانەوادەو ژیان...) وەکو پێداویستی دەرەوە باسی لەسەر دەکرێت و تەنگژە بۆ تاك دروست دەکات،ئەوا تیۆرییە مەعریفییەکان هێڵێك لە دەروونزانیی تاك دروست دەکەن بە پێی تاك و کەسایەتی و کۆمەڵ و جوگرافیاو مێژوو دەوڵەت دەگۆڕێت.کاتێك ماسلۆ باس لە پێداویستی فەسلەجی تاك دەکات سەرشێتانە داوای





تێربوونیان دەکات کە هەر پێداویستە و تەواوکراوی ئەوەی تریانە وەکو هاوکێشەی ماتماتیکی لە دوای ژمارە (١) ژمارە (٢) دێت، تا یەك تەواو نەبێت ژمارە دوو خۆی نیشان نادات،واتە زنجیرە پێداویستی فەسلەجی و ژینگە وا لە مرۆڤ دەکەن وەکو ئامێرێك بە دوای جێبەجێ کردنیان بگەڕێت، بەلاَم زۆر ئایتمی تر هەن کە ڕێساکانی تاك و کۆمەڵ دروستی دەکەن وەکو تەگەرە لەبەردەم ئەم جێبەجێ کردن و تێربوونە دەگرێت، مرۆڤ وا بەستەی کۆمەڵێك فاکتەری جۆراوجۆرە، وەکو سانسۆرێك لەسەری کار دەکەن کە ناتوانێت لێیان دەرباز بێت. کاتێك باس لە ئازادیی تاکە کەسی دەکرێت دەخرێتە ڕیزبەندی کۆمەڵێك پێداویستی تاك-ەوە ئەو کاتە بە پێی یاسا و دابونەریتی کۆمەلاَیەتی لێکدەدرێتەوەو ئازادیی تاك هەڵدەسەنگێندرێ جگە لەوەی ئازادیی تاك بەپێی سیستەمی تێربوونی فەسلەجەی‌تاك لێکدەدرێتەوەو لەهەمان کاتدا بەپێی پێداویستی هاوسەنگ بوون لەگەڵ کۆمەڵ و دەوروبەر شی دەکرێتەوە، واتە ئازادیی ڕەها لە هاوکێشەی تاکدا وەدەردەنرێت، کاتێك خودی تاك بەشێك دەبێت لەو ئازادییە، هیچ کاتێك نەشاعیر و نە نووسەر ئازادانە وشەکان دەرنابڕن، ئەگەر لێکدانەوەیەکی سایکۆلۆژیی بۆ بکرێت ئەوا شاعیرەکان یان نووسەرەکان لە ژێر دەوارێکی تاریکدا قڕ لە سانسۆری خود کاردەکەن،ناتوانن ئەوەی خۆی دەیەوێت و ویست و ئیرادەی ئەوە ئەو بکاتە مەیدانی باسەکانی، گەڵێ جار ئازادانە قەڵەم بەکاردەهێنێت، بەلاَم سانسۆری خود وای لێ دەکات حەزو مەیل و بۆچوونی بەپێی دەوروبەر پۆلین بکات، شاعیرەکان، دەڵێن ئەوەتا ئەوەی دەتانەوێ نەك ئەوەی من، ئەمەش لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە میکانیکی بەرگریی دەروونییە کە مرۆڤ بۆ خۆ دەربازکردن لە ڕووخانی خەد بەکاری دەهێنێت و گەڵێ جار بۆ بەتاڵ کردنەوەی حاڵەتێکی دەروونی بەکاردێت، هەندێك وشە دەستپێشخەری دەکات یان هەندێك پەرەگراف دەبێتە پێشەنگی دەربڕینی ئازادیی تاك،بەلاَم لە هەمان کاتدا وشە لە جێگایەك دەنووسێت کە بوونێکی دیمۆگرافی و ئەپستمۆلۆژیی هەنووکەیی دروست دەکات ناتوانێت لە

دابڕانێکی زەمەنی وشەکان بتاشێت ئەگەر شیعرەکان و نووسینەکان و ڕەنگی کەڤاڵەکان سوریالی و ئەبستراکت بێت، بەلاَم گوزارشت لە ئێش و ئازاری خەڵکانێك دەکات ئەو ڕەنگ و وشە دەکاتە زمانی دەربڕینی ئازادی..((ئەدلەر)) دەڵێ لەسەردەمی تازەدا، لەسەرو بەندی بەتاك بوونی کۆمەڵ و تەکنەلۆژیادا و پاکژبوونەوە لە گرێ ئاڵۆزییە دەروونییەکان و بەتاڵ کردنی لەش لە ڕووح کە سەرچاوەی گێرەشێوێنی و هەڵچوونی ململانێ‌یەکانی تاکە بەرامبەر سروشت، لەو کاتە سانسۆرەکانی خود زیاتر فشار دەخەنە سەر تاك و بەرەو گۆشەگیری دەبەن.

سایکۆلۆجستەکان دەڵێن دووتەوەری بیرکردنەوە هەیە، تەوەری بیرکردنەوەی تاك لەگەڵ تەوەری بیرکردنەوەی کۆمەڵ (هزری کۆمەڵ) کە هەردووکیان کێشەی ڕەوشت و هاوسەنگ بوون لەگەڵ ژینگەدا دروست دەکەن، بەلاَم لە بیرکردنەوەی تاك وای بۆ دەچن کە گەڕانەوە بۆ سایکۆلۆژییەتی مارکسیزم گەڕانەوەیە بۆ کاریگەریی باری ئابووری لەسەر خود و ڕەوشتی لە ژینگە، سانسۆرەکانی خود لەسەر بنەما ئابوورییەکان دیاری دەکرێت، هەموو سایکۆلۆجستەکان بنەمای ڕەوشت و پەیوەندییە کۆمەلاَیەتییەکان دەکەنە پێوەندیی بەرهەمهێنان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و بەگرووپ بوونی تاك واتە لێکدانەوەی باری ئابووریی توێژێکی کۆمەڵ، کاتێك پێوەندیی بەرهەمهێنانی کەسێك لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێت، بارە سایکۆلۆژییەکان و پێوەندییە ڕەوشتیەکان دەگۆڕێت. ((کارل ڕۆجرز)) لە دەروونزانیی مارکسیزم‌دا دەڵێت، لە تاکدا گۆڕانکارییەکانی ڕەوشت و پێوەندییەکانی تاك وا بەستەی باری ئابوورین، پانتایی ئازادیی تاك بەستراوەتەوە بەکێرڤی خودی بوونی بەرهەمهێنان، واتە تا چەند خاوەنی بەرهەمی خۆیەتی ئەوەندە دەتوانێت دەستەلاَتی زاڵ بوون بەسەرەوەو ڕووبەڕوو سروشتی پێوەندییەکاندا بڕوات، واتە پێوەندییە ئابوورییەکان ململانێی دەروونی و کێشەی هاوسەنگ بوون دیاری دەکەن و سانسۆریست لە پێوەندییە ئابوورییەکان دیاری دەکرێت، کاتێك باس لە دیموکراتیزەکردن دەکرێت ناتوانرێت بەراوردکاری



شوێنەکان بکرێت لە ڕووی سایکۆسۆسیۆلۆژییەوە ئازادی و دیموکراتیزەکردن واتە بەشێك لە ژیانی خەڵك و خودی خەڵکەکە بەشێکن لە پرۆسەیە، چونکە هیچ دەوڵەتێك و سیاسەتێك ناتوانێت پەیڕەوی ئەو سیستەمە بکات، ئەگەر خودی خەڵك بەشێك لە یاسایە و دیموکراتییە نەبن، ئەمەش بە هۆی وشیارییەوە دەبێت تاچەند وسیاریی تاك بەرزبێت ئەوە ئەو پرۆسەیە بەرقەرار دەبێت. سانسۆرە خودییەکانیش کەمتر دەبن و هاوسەنگی زیاتر دەبێت. ئەمەش خۆی لە خۆیدا غەیب بوونی خودی نەزۆکی ئەو عەقڵییەتەیە واتا جیهانبینییەکی تایبەت نییە، بەڵکو زیاد بوونی سانسۆرەکانی خودە لەسەر مرۆڤ کە پێی دەوترێت سانسۆرە سروشتییەکان کە سایکۆلۆجستەکان پێی دەڵێن ڕێگرەکانی دەربڕینی ئازارەکان و مەرامەکانی عەقڵی ناوەوەی مرۆڤ، کاتێك مرۆڤ باس لە کەسایەتیی دووەمی وەهمی خۆی دەکات بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، فاکتەرەکانی بە کۆمەلاَیەتی بوون و ژیاری ون دەکات، چونکە ئەوەی جیهانبینیی خۆی بەرهەم نەهێنێت، جیهانبییەکانی یاخود بلێین سانسۆرەکانی دەوروبەر بەسەر خۆیدا دەسەپێنێت، هەر لەبەر ئەوەشە عەقلاَنییەتی ئێمە تا ئێستا نەیتوانیوە شتێکی ئەو تۆو ماددی بۆ دەوروبەر زیاد بکات. هەموو تیۆرییە کۆمەلاَیەتییەکان وەردەگرێت، بە ئەندازەیەك لاواز دەبێت کە تەنیا دەتوانێت دیالۆگ لەگەڵ عەقڵەسادەو ساکارەکاندا بکات، تەنیا هێزی وەلاَمە کۆنەکانی پێ دەمێنێت و توانای پرسیارکردنی ڕووداوەکانی لانامێنێت لەژێر میکانیکی دەروونی دەرناچێت، ئەگەر خۆ خستنی ئەقڵی ئێمە هاتنەکایەی کۆمەڵێ لێکدانەوەی خورافیانە و گومان لێکراو بووە لەسەر خود کە دەرئەنجامەکەی هێجگار سەخت بووە لەسەر مێژووی پێشکەوتنی عەقڵی مەعریفی کە نەیتوانیوە لە میکانیزمی هۆکارەکانی نوشتییە مەعریفییەکان بیربکاتەوە. ماسلۆ دەڵێت: گەلێ جار بۆ تێربوون و ڕەهابوونی چێژی پێداویسەکان تا هاوسەنگی بەدەنی و دەروونی و کۆمەلاَیەتی دەستەبەر بکات، ئەوا تاك میکانیکی بەرگریی دەروونی بەکاردەهێنێت بۆ لابردنی سانسۆرەکانی خود. مرۆڤ لە ژیانیدا کۆمەڵێك پێداویستی

فسیۆلۆژی و دەروونـی هەیە،تێرکردنیان دەبێتە مایەی خۆسازاندن لەتەك ژینگە و کۆمـەڵ بـەردەوام بـوون لـە ژیـان و تـێرنەکردنی پێداویسەکان و بێبەش بوون لێیان کۆمەڵێك گێروگرفت و ئەندێشەی جەستەیی و دەروونی بۆ ئەو مرۆڤە دەخوڵقێنن بـۆ گۆڕیـنەوەی خـودە سانسـۆرەکان دەرچـوون لــە دڵــەڕاوکێ بـۆ تـێرکردنی پێداویستەکان،ناچار تـاك پـەنا دەباتەبـەر هـەندێك کرداری سایکۆ-فەسلەجی وەکو چەسـپاندن،بریتیـیە لـە پرۆسـەیەکی ڕاکێشـانی ململانـێی دەروونـی لـە بازنـەی ئاگایـەوە بۆنائاگای کە ئەو پێداویستییانەی ناتوانێ لە ترسی دابونەریت و یاساکانی کۆمـەڵ و ئـاین... دەربـڕێ لە نائاگا (اللاشعور) بەشێوەیەکی کاتی دەیشارێتەوە، ئەو کاتـە تـاك هەست بـە کـەمی و بـێ هـیوایی دەکات، بـەڵام لـەکاتی خەون و خەیاڵ و بێهۆشی دەتوانێت کەمـێك لـەو چـەپاندنە (کبـت) کـەم بکاتەوەو دوور لە سانسۆری خود کار بکات.

جۆرێکـی تـریش هەڵگەڕانەوەیـە لـە میکانـیکی بەرگـریی دەروونـی، زۆر جـار مـرۆڤ تووشـی حاڵەتـێکی وا دەبێـت بارودۆخـێکی نالـەبار خەریکە هێزو توانای خودی ئەو کەسە لەناو ببات. لەو کاتەدا خود بە ناچاری پەنا بۆ میکانیکی هەڵگەڕانەوە دەبات، ئەمـیش هەڵدەسـتێت ئـەو ململانێـیە دەروونیـیە دەگوێزێـتەوە بـۆ جەسـتەی ئـەو مـرۆڤە کـە دەوری تـێدا دەبیـنێ وەکو سـەرباز لـەکاتی شـەڕدا ئایا دەکوژرێ یان دیل دەبێـت یـان ڕا بکـات،بـە ترسـنۆك لەقەڵم دەدرێت ئەو کاتە تووشی هستریا یان لاڵی دەبێـت. جۆرێکـی تـریش پـێی دەڵـێن نکوڵـیی خـود (نکـران الـذات) هـەر بیرێـك و بۆچوونێك گرفت بـۆ حـەزو پێداویستییەکان لە هەستی مرۆڤ ئازارو گرژی دروست بکات، مـرۆڤ کـردارەکە پشتگوێ دەخـات و خـۆی لێ ڕزگـار دەکـات، بـە گواسـتنەوەی هەسـتەوە بـۆ نەسـت ئـەم گـوێ نەدانـە وای لێ دەکـات پـێوەندیی دەپچـڕێ لەگـەڵ خـەڵکانی دەوروبەری و وای لێ دێت ناوی خۆشی لەبیردەچێتەوە، ژیانێکی پڕ لەخەو و خـەیاڵ بەسەر دەبات،ئەوەش یەکێکە لە دیاردەکانی نەخۆشیی (پارانۆیا). کارێکی تـر بـۆ دەربـاز بـوون لـە سانسـۆرەکانی واقـیعی و دەوروبـەر، زیـندەخەونە، کاتـێك





پاڵەپەسـتۆو گێروگرفـتەکانی ژیان زۆر دەبن و هەڕەشە لە خودی مرۆڤ دەکەن مرۆڤ ناچـار دەبێـت پـەنا بـۆ خـەو و خـەیاڵ و فەنتازیای زیندە خەون ببات کە جیهانێکە پـڕە لـە پاڵەوانـبازی و قوربانـیدان و تـێرکردنی حەزو ئارەزووەکان و پێشێل کردنی دابونەریت و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان کە لە ڕێگەیەوە مرۆڤ ئەسپی خەو و خەیاڵی خـۆی تـێدا تـاو دەدات، دوور لـە سانسۆرەکانی سروشتی. تێکشکاندنی هەموو سنوور بەندیـیەکانی سانسـۆرەکانە، واتــە لــە دەرئـەنجامی ئـەو تۆژیـنەوەیەدا بۆمـان دەردەکەوێت هەرچەندە خودە سانسۆر زیاد بن مرۆڤ بەرەو جووت کەسێتی دەچێت ڕەهـەندەکانی پـێوەندیی نـێوان کەسایەتیی واقـیعی کۆمەڵایـەتی و خـەیاڵی خـودی لێکدەترازێـت و دوور دەبــن نــاتوانن پــێوەند بگــرن و بــە کۆمەڵایــەتی بــن، سایکۆلۆجستەکان ئـەوەیان دەرخستووە هـەر چـەندە پانتایی نێوان کەسی واقیعی و کەسـی خـەیاڵی کەم بێت ئەوا تاك لە فشاری سانسۆر ڕزگار دەبێت و هزرێکی ژیاریی دەبــێ و دەبێــتە بەشــێك لــە بەڕێوەچـوونی پرۆســەی ئــازادی و دیموکراســی و مەدەنییەت و خۆ گونجاندن لەگەڵ دەوروبەرو داهێناندا...

## سەرچاوەکان


١-حامد عبدالسلام  زهران، علم النفس الاجتماعي، عالم التب،القاهرة، ١٩٧٧.

٢-مصطفى أحمد فهمي، التكيف النفسي، مكتبة مصر، القاهرة، ١٩٧٨.

٣-د. أحمد عزت راجح، أصول علم النفس، الدار القومية، للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٨٠.


# چەمکی  جیهانی  ناوەوە

فاکتەرەکانی دەوروبەر، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەوڵی هاوسەنگی دەدەن لەگەڵ مرۆڤدا. سایکۆلۆجستەکان دەڵێن،کاتێك تاکی مرۆڤ لەکارە زیندووەکان بەرەو چالاکیی دەروونی دەچێت لە شێوەی ئاسانەوە بۆ شێوەی ئاڵۆز، ئەوا جیهانی ناوەوە، زۆر ئاڵۆزترو ڕەگەزتر دەبێت لە جیهانی دەرەوە بەهۆی زۆری ورووژێنەکان. دەروونزانەکان زۆرجار هاوکێشەی مرۆڤ لەسەر دوو تەوەری شیکردنەوەی دەروونی شی دەکەنەوە،

یەکەم:دەرخستنی یا چالاکیی ناوەوەی مرۆڤ و بواری کارلێکردنی لەگەڵ جیهانی ورووژێنەکانی دەرەوەدا.

دووەم:دەرخستنی پەیوەست بوونی گونجاوەکانی ورووژاندنی جیهانی دەرەکی بەرامبەر هاوکێشەکانی هەڵچوون لە جیهانی ناوەوە، ئەم دوو تەوەرە وەکو ئامانجێك دەتوانرێت لە تاك بەدی بهێنرێت،مادام مرۆڤ توانای پێشکەوتنی ورووژێنەکانی هەڵچوونی ناوەوەی هەیە.دەروونزانی هەوڵی دۆزینەوەو ئاشکرا کردنی پێوەندییە چاوەڕێ کراوەکانی چالاکیی ناوەوەی (دەروون)ی مرۆڤ لەگەڵ ورووژێنەکانی دەرەوەدا دەدات.

ئەمەش سایکۆلۆجستەکان دەڵێن، ئەم دۆزینەوەیەکارە وا ئاسان نییە، ڕەنگە هەندێك کەسی وا هەبن،کەسایەتیی گوم کراویان هەبێت و جیهانی ناوەوەی (دەروونی) هاوگونجاو نەبێت لەگەڵ ئایتمەکانی دەرەکیدا، ئەو کاتە کەسایەتییەکی نامۆی دەبێت هیستریانە دەژی، ئێمە بەڕێگای دەروونزانی کلاسیکی، ناتوانین توێژینەوە بۆ هاوکێشە دەروونییەکان بکەین و بگەینە ئامانجێکی کۆتایی، بۆیە پێویستمان بە دەروازەی تازەی دەروونزانی هەیە تا پێبناسەو هاوکێشەی چەمکی جیهانی ناوەوەو پەیوەست بوون بە جیهانی دەرەوە شی بکەینەوە.



جیهانی ناوەوە وەکو کۆئەندامێکی تۆڕی ئاڵۆزی زانیاری کاردەکات کە چەندان جفرەی شی نەکراوەی هەیە،لەپاڵ هەموو گۆڕانکارییەکی ڕەوشتی و مەعریفی مرۆڤ،پاڵنەرێك و وزەیەکی ناوەکی هەیە کە هێما شاراوەکان شی دەکاتەوە،



گەورەترین ئەو هێزانەش پاڵنەرە، لە بچووکترین ورووژاندنی هەستی، واتە بەرکەوتنی ورووژاندنی دەرەکی بۆ سەر ئەندامی هەستەوەر، باری گرژی و شلەژان دروست دەکات کە سایکۆلۆجستەکان پێی دەڵێن (هومیوستاسز) واتە هاوسەنگی ناوەوەی مرۆڤ لەکاتی دروست بوونی باری گرژیدا بە هۆی ورووژاندنی هەستەوەرەکان و گواستنەوەی لە جیهانی ناوەوە بۆ جیهانی دەرەوە.

جیهانی ناوەوە ئاستی دووەمی هاوکێشەی دەروونزانییە، چونکە هەر ورووژاندنێکی دەرەکی بکەوێتە سەر ئەندامی هەست ئەوا گۆڕانکاریی کیمیایی لە خانەی هەستەوەر ڕوودەدات. بۆ نموونە: ڕووناکی دەبێتە گۆڕانی کیمیایی خانەی بینین کە نا هاوسەنگی دروست دەکات،دەبێتە هۆی جوولانەوەی خانەکانی ناوەوە کە وزەیەك پەیدا دەبێت بروسك ئاسا،گۆڕانکاری ورووژاندن لە تەوژمی هەستەوە بۆ کۆمەڵی خانەی مێشك دەگوازێتەوەو لە ڕێگای هەستەوەرەکانی بینینەوە ڕاستەوخۆ وەلام دانەوە دروست دەبێت بە هۆی بچووك بوونی بازنەی چاو، خاو بوونەوەی پێڵووەکان بۆ ڕێگا گرتن لە ڕووناکیی هاتوو کە چاو ئازار دەدات، ئەو کاتە گۆڕانکاریی کیمیاوی کۆتایی دێت و هەستەوەرەکان باری ئاسایی وەردەگرن، هاوسەنگیی ناوەوە دروست دەبێت و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت بۆ گرتەیەکی تری بینین لە دووری و رەنگ و قەبارەی جیاواز بە هۆی گۆڕانکاری کیمیایی جیاوازەوە.ئەم نموونەیە ئەوە دەردەخات ورووژاندنی بەرامبەر ئامادەیی هەیە بۆ گۆڕان و ون کردنی هاوسەنگی ئەندامەکانی هەست و تێکچوونی تاك لەگەڵ ژینگەدا، لە هەمان کاتیشدا ئامادەیی هەیە بۆ گەڕاندنەوەی هاوسەنگی وەکو وەلام دانەوەی ئاگاداری خانەکانی مێشك.

سایکۆلۆجستەکان دەڵێن: مرۆڤ بوونەوەرێکی زیندووە، هەڵگری هەستەوەرو ورووژاندنی دەرەکییە بۆ وەلامدانەوە وەکو سیمای گونجان و هاوکێشە بوونە لە شێوەی شلەژان دڵەراوکێ لە ئەندامەکانی هەست، هەموو شلەژانێك و بارگرژییەك لە ئاستی دیاریکراودا دەگۆڕێ بۆ ئاگادارکردنەوەی ئامێری هەستەوەر.

زۆر جار فشاری زۆرو زەبرو زەنگی دەرەکی لەسەر هەستەوەرەکانی تاك، ئەندامەکانی مێشك ناتوانن وەڵام دانەوەی پێویست بدەنەوەو تاك لە تاوگیری بەتاڵ بکرێتەوە، بە هەر ڕێگایەك بێت،ئەوا ئەو کاتە تووشی ئێش و ئازاری دەروونی دەبێت و چەمکی جیهانی ناوەوە دەگۆڕێت وهاوسەنگی نامێنێت و هیستریای کاتی دروست دەبێ لە هەندێك ڕەوشتی گۆڕاودا. زۆر جار دیلە سیاسییەکان ڕادەبەدەر فشاریان دەخرێتە سەر، بەڵام هیچ وەڵام دانەوەیەکی مەبەست بەهەمان ئاراستەی وروژاندنەکە دروست نابێت،دەبێتە تێکچوونی باری دەروونی و نائارامیی بەردەوام.لەسەر ئەم بنچینەیە دەتوانین پێوەندی نێوان دەرئەنجام و هۆکاری وەڵام دانەوەی وروژاندن بزانین لە ڕێگای دوو جۆری ((هومیوستاسز)) جولاوەو هومیوستاسزی جیگیر کە پێوەندی دیاریکراوە لە نێوان وروژاندن و وەڵام دانەوە دروست دەبێت لەگەڵ هومیوستاسزی جووڵاوە کە هاوسەنگی ناوەوەو دەرەوە بە پێی کات و شوێن و جۆری پێداویستی دەگۆڕێت کە پێوەندی وەڵام دانەوە بە وەڵام دانەوەیەکی تر دەبەستێتەوە کە پێی دەوترێ بزوێنەری پێداویستییەکان لە مرۆڤ، هەندێ لە دەروونزانەکان پێی دەڵێن پاڵنەر یان غەریزە و بۆچوون و مەیلی تاك بۆ بوارێکی ناوەوەی مرۆڤ بۆ تێربوونی هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ و وزەیەکی ناوەوەی تاك هەیە، تاك ئازار دەدات و نائارامگیر دەبێت. ئەنجامی ئەم ئازارە ڕەوشتێکی شەڕانگێزی پەیدا دەبێت کە بە دوای کایەی تێربوونی پێداویستییەکان دەگەڕێت تا قۆناغی تێربوون و ئارامگیری، بەڵام ئەگەر ئەم وزەیە گەمارۆدرا لە ناخی تاك بە هۆی بوونی تەگەرەو کۆسپی (کۆمەڵایەتی، دەروونی، ئابووری)یەوە، ئەوا تاك تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت بەهۆی تێر نەبوون و هەست بە فەراغێکی بەردەوام دەکات لە لایەنی (کۆمەڵایەتی و فەسلەجی و دەروونی)یەوە کە تووشی خەمۆکیش دەبێت،کردەوەی هیستریای دەکات ئەم کردەوەیە بەردەوام دەبێت تا شێت دەبێت، لە ئەنجامی تێرنەبوونی پێداویستەکان یان لادەر دەردەچێت و لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەڵدەگەڕێتەوەو بەرپەرچی دابونەریت و یاساکانی کۆمەڵ





دەوەستێتەوە یان لە ڕووی ئابوورییەوە فڕوفێڵ و دزی و بەرتیل وەردەگرێ لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجی بەڕەڵڵاکردنی وزە پەنگخواردووەکەو لە ڕووی ئاکارییەوە کاری سیخوڕی و کوشتن و خۆفرۆشتن دەکات لە پێناو بە دەستهێنانی پێداویستەکانی بۆ ڕزگار بوون لە هاوسەنگی کە ئەم وزەیە بەرەو ڕەوشتی شەڕانگێزی دەیبات،ئەگەر بە هیچ ڕێگایەك نەیتوانی لەم دڵەڕاوکێیە دەرباز بێت، ئەوا ئەو وزە گەمارۆدراوە، دەیخاتە حاڵەتێکی نائاگایی و ئەنجامەکەی بە خۆکوشتن کۆتایی دێت. جا ((ئەدلەر)) زۆربەی کارە بەدڕەوشتی و ناباوەکانی تاك بەرامبەر کۆمەڵ دەباتەوە بۆ تێر نەبوونی پێداویستەکان. هەمان زانا لە نووسراوی (ترسان لە ئازادی)دا،هەموو کارە شۆڕشگێری و دکتاتۆری و سەرکوتکراوەکان و تێکدەرەکان لەتاك و کۆمەڵ دەگەڕێنێتەوە بۆ تێرنەبوونی پێداویستەکان و بەکار نەهێنانی ئەو وزە شاراوەیە لە کارێکی گونجاو لە شوێنی خۆی بۆ خۆدەرباز کردن، تاك ناچار دەبێت ڕەوشتی توندونیژی (ئەرێتی و نەرێتی) بنوێنێت، بۆیە زۆر جار دەبینین نە بەکاری بۆماوەیی و ژینگەیی و پەروەردەیی چاکسازی بکرێت، چونکە ئەمە کارێکی خودی نائیرادییە. فرۆید دەڵێت: ((ئەم بزوێنەرە ڕەوشتیانە لە تاك هەموویان بەیەکەوە بە هۆی کردارێکی زیندووەوە گرێ دراون کە ئەم پێوەندییە دەبێتە هەڕەشە کردن بۆ سەر سەلامەتی تاك خۆی زۆرجار پێداویست، دەبێتە هۆی ڕەوشتی سەیر لە تاك وەکو کەمیی خوێ لە لەشی منداڵ، دەبێتە هۆی ڕەوشتی سەیرو خواردنی خۆڵ ڕەوشتی پشت بەخۆ نەبەستن و کەللەڕەقی و نائارامی وزۆربەی زانایانی فسیۆلۆجی،وشەی پاڵنەر وەکو بەدیلی باری هاوسەنگیی ناوەوە (هومیوستاسز) بەکار دهێنن کە بەستراوەتەوە بە حەزو ئارەزووە سایکۆلۆژییەکان.

گەلێ جار توندی و شڵەژان و دڵەڕاوکێ کە بەهۆی پێداویستیی بایۆلۆژی بێت، ئەوا ڕەوشتی تاك بەبێ هۆشیاریی دەوروبەر دەگۆڕێت. پاڵنەر ئەو بارە دەروونییەیە کە کار دەکاتە سەر مرۆڤ بۆ گۆڕانی ڕەوشتی تا دەگاتە ئامانجی خۆی یان ئەو بارە دەروونییەیە یان بەدەنییەیە کە ڕەوشتی مرۆڤ دیاری دەکات بۆ ئاستێکی دیاریکراو،

پاڵنەریش بریتییە لە پێداویستیی فسیۆلۆژی و دەروونییەکان، سۆزو خۆشەویستی و ئاڵوگۆڕکردنی ئەو سۆزە بەرامبەر کەسانی دەوروبەرو خاك و گەل و نیشتمان، تەنانەت گەلێ جار، سۆز بەرامبەر ئاژەڵیش بە هۆی پاڵنەرەوە دەبێت، خوو لە پاڵنەر واتە کاتێ یەکێ لە پێداویسییەکانمان بۆ جێبەجێ ناکرێت، ئاراستەی ڕەوشت ون دەبێت، ئەوا بۆ دەربڕین لە نیگەرانی خوو بەشتێکەوە دەگرێت، واتە گۆڕینەوەی پێداویستی بە نیگەرانی. پاڵنەر بریتییە لە حەزو ئارەزووەکانمان کە لە کاتی لەدایك بووندا لەگەڵماندا دەبێت تاکو مردن هەوڵی بۆ دەدەین، بەڵام مەیل و بۆچوونەکانمان پاڵنەرێکی کاتین و لەتەمەنێکی دیاریکراودا سەرهەڵدەدەن و کۆتاییان دێت، بەڵام لێکۆڵینەوە لەهەندێك کردەوە وەکو هێزێکی شاراوەی پاڵنەرە.

پاڵنەر وەکو هێزێکی شاراوە لە بەرامبەر تاك بریتییە لە پارێزگاری کردنی تاك و مانەوەی وەکو خۆی (برسیەتی، تینوویەتی، نووستن...)، هەروەها بریتییە لە پارێزگاری کردنی جۆری تاك و پاراستنی وەچەی مرۆڤ و ئاژەڵ وەکو (دایکایەتی، زاوزێ و مردن...)، چونکە لەهەموو بوارێکدا دەروونزانەکان دەڵێن فرمانی پاڵنەر وەکو هەموو فرمانەکانی تری ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ بریتییە لە جووڵانەوەو چالاکیی ڕەوشتی تاك و ئاراستەکردنی ئەو ڕەوشتە تا دەگاتە ئامانجی خۆی، ئەمەش لەسەر هەردوو جۆری سەرەکی پاڵنەر دەبێت، جۆری زگماك و یان پاڵنەری سەرەکی کە بەبێ دەسەڵاتی تاك کاری خۆی دەکات و ڕەوشت دەگۆڕێت بۆ شوێنی دیاریکراو کەلە هەموو مرۆڤێك و ئاژەڵێکدا لە کاتی لەدایك بوونەوە تاکو مردن هەیە و وەکو یەك کاریگەری هەیە، پاراستنی تاك دەکات لە بوون و جۆری لەهەموو مرۆڤێکدا، پاڵنەر پێداویستییەکی فسیۆلۆژییە بۆ هاوسەنگیی بوونی لەش و هاوسەنگیی سۆزی وەکو سۆزی دایکایەتی، بەڵام پاڵنەری کاتی یان ناوەندی کەبە پێی ژینگە و کات و تەمەن دەگۆڕێت، بۆیە لەهەموو کەس وەکو یەك نییەو بریتییە لە پاڵنەری کۆمەڵایەتی و دابونەریت و شارستانیەت و بەمەدەنی بوونی کۆمەڵ، لەگەڵ پاڵنەری دژایەتی کردنی کردەوەی نارەوا یان دژە ڕاوەستان و دژەبۆچوون و پاڵنەری





داگیرکردن و موڵکایەتی و خۆخۆشەویستیدا، بەڵام ئەو پاڵنەرەی کە لە نێوان هەردووکیان دا هاوبەشە، پاڵنەری یاری کردنە. منداڵ بۆ دروست کردنی هاوسەنگیی ناوەوە لەگەڵ دەرەوەدا، کاتێك منداڵ لەیەکەم سووڕی گەشەی خۆیدا وزەیەکی شاراوە کۆدەکاتەوە لە جیهانی ناوەوەی، بۆ سەرف کردنی ئەو وزەیە دەبێ پاڵنەرێك هەبێت، ئەویش یاری کردن و جووڵانەوەی زۆرە. ئەگەر ئەم وزەیە بەهۆی پاڵنەرێك سەرف نەکرێت، ئەوا منداڵ تووشی داچەپین دەبێت یان لەڕێگای شەڕانگێزییەوە سەرفی دەکات. لەکۆتاییدا سایکۆلۆجستەکان دەڵێن، چەمکی جیهانی ناوەوە، ئەو پرۆسە خودڕێکخراوەیە کە دەتوانێت سیستەمی بایۆلۆژی لە لەشی مرۆڤ ڕێك بخات و هاوسەنگی و ڕاست کردنەوەو ئارامی بۆ دۆخی ژینگەی ناوەوە پەیدا بکات بۆ مانەوەی تاك لە ژیاندا، ئەو پرۆسەیە داینامیکی بەردەوامە لە ژێر کۆنترۆڵی ڕێکخراو کە بتوانێت لە کاتی ڕوودانی هەر شڵەژان و تێکچوونێکی باری دەروونی تاکدا، دووبارە هاوسەنگی بگەڕێتەوە تاك بخاتە باری دەروونی ئارامییەوە، چونکە هەموو پرۆسەیەکی تەواوکراو هاوگونجانی فرمانی فسیۆلۆژی و دەروونی کە دەتوانرێت دەستی بەسەردا بگیرێت بەهۆی دەمارە ئەندامی خۆنەویست و ڕژێنی دەرەقییەوە لەناو لەشیدا کە هەموو کاتێك، هاوسەنگی لەنێوان ناوەوەی لەش و ژینگەدا دروست دەکەن لە ڕێگای (فووت باك) و لە بەرزترین پلەوە بۆ نزمترین پلەی دیاریکراو لە لەشدا.

هومیوستاسز پارێزگاری هەموو شلەمەنیەکانی لەش دەکات لە نێوان ترشیەتی و تفتیەتیی ڕژێنەکانی لەش ﴿PH =PH+﴾ کەوا پلەی گەرمای لەش لە یەك ئاستی دیاریکراودا دەهێڵێتەوە، ئەو هاوسەنگییەیە لەنێوان ترش و تفتی لەش، تاك لە هەڵچوون و تووڕەبوون و لاساری و لادان و شڵەژانی دەروونی دەپارێزێت.

## پەراوێزەکان

★ هومیوستاسـز (HOMEOSTASIS) وشـەیەکی زانسـتیی فسـیۆلۆژییە بـە مانـای پرۆسـەی ڕێکخـەری هاوسـەنگی جـیهانی نـاوەوەی مـرۆڤ و ڕێکخسـتنی غەریـزەکانی مـرۆڤ لەگەڵ ئایتمەکانی ﴿ژینگە + تەمەن + پێداویستی﴾دا دێت.

★ غەریـزەکان: سایکۆلۆجستەکان،بـە بنچینـەی سـەرکیی پێداویستیی فسیۆلۆژی و شوێنی چێژەکانی مرۆڤیان داناوەو داینەمۆی کارە خۆنەویستەکانی ناوەوەی مرۆڤن و گەورەترین بەشی کەسایەتییان داگیرکردووە.

## سەرچاوەکان


١-عبدالسلام عبدالغفار، مقدمة في الصحة النفسية، القاهرة، دار النهضة، ١٩٧٦.

٢-محمد عماد الدين اسماعيل، المنهج العلمي وتفسير السلوك، القاهرة، دار النهضة، ١٩٦٢.

٣-يوسف مراد، مبادىء علم النفس العام، القاهرة، دار المعارف بمصر،١٩٥٤.

٤-عبدالعزيز القوصي، علم النفس العام، اسسه وتطبيقاته، القاهرة، دار النهضة المصرية، ١٩٥٢ .

٥-د. فائق السامرائي، الاتزان البدني،مجلة علوم، العدد ١١٠،سنة ٢٠٠٠،بغداد.


# ئەنتی کەسایەتی

## (خەسڵەتی نامۆبوونی تاك)[١٤]

دەستەواژەی دژە کەسایەتی وەك چەمکێکی تازەگەریی دەروونزانی پەیڕەو دەکرێت، لەمـێژووی سـەرهەڵدانی دەروونـزانی و لـێکدابڕانی دەروونـزانی لـە فەلسـەفە، ئـەوا چـەمکە تایبەتـیـەکانی دەروونـزانی و لقـە جۆراوجۆرەکـانی ئـەم بـوارە بووژانـەوەو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی مەیدانی و زانستی زۆری لەسەر کرا.

لەسـەردەمی گلۆبالیزم چەمکی ئەنتی کەسایەتی پێناسەیەکی گشتگیرە بۆ سەلماندنی خود لە نێوەندی پێداویستییەکانی فەسلەجەیی و ژینگەیی.



کەسـێتیی تـاك ڕابـەری ڕەنگدانـەوەی ڕەوشـتەکانی نـاوەوەی تاکـەو هاوسـەنگ بـوون لەگـەڵ دەوروبـەر.هـەر کاتـێك ڕەهـەندەکانی هاوسەنگ بوونی حەزو ئارەزووەکان و پێداویستیەکانی هەنووکەیی مرۆڤ لەگەڵ دەوروبەر لێکترازاو تووشی دابڕان هات لە پاشـەڕۆژ.ئەوا ئەنتی کەسایەتیی نامۆبوون دەگەیەنێت، نامۆبوونی تاك لە ڕوانگەی سـایکۆلۆژییەوە ئاڵۆزتـرین و سـەختترین کێشەی خۆژی تاك دەگەیەنێ، واتە دابڕانی تاك لە چێژە هاوسەنگەکانی خودی خۆی لەگەڵ پێداویستی و حەزو ئارەزووەکانی و دەوروبـەری.کەسـایەتی وەکو پێناسەو ناسنامەی تاك دەگەیەنێت کە لەژێر چەندین ڕەهـەند و فاکتـەر دروسـت دەبێت،واتە کەسایەتی بریتییە لە ڕێکخەرێکی دینامییە لـە تـاك سـیمای گونجانـە لەگـەڵ دەوروبـەردا و زنجیرە گۆڕانـێکە لـە ڕووداوەکانی دەوروبـەردا و زنجیرە گۆڕانـێکە لـە ڕووداوەکانی هەڵچـوون و کۆمەڵایـەتی لـە تـاك کـە لـە یـەکتریان جـیا دەکاتـەوە لەگـەڵ مـرۆڤی نـەخۆش و دابەش کردنی کەسایەتی لەسەر بنچینەی سیمای کۆنترین بیرو بۆچوونە لەسـەر کەسـایەتی و شـێوەی دەرەوە کـە خـەڵك لـە یـەکتری جیا دەکاتـەوەو ئەمەش ئەمانـەن‌سـیمای خوێنـاویی سـیفەتەکانی بریـتین لـە (گەشـبین، چالاك، ئاسـانە، بـۆ وەلاّم دانەوە خێرایە، گەرم و گوڕە، باوەڕی بەخۆیەتی).

جـۆری دووەم سـیمای بەڵغـەمی (میزاجی) سیفەتەکانی وەکو (خاوە، ساردە، تەمەڵە، لەمامەڵەکـردن بـێ ئاگایـە....). جۆری سـێیەم سیمای زەردباو وەکو (زوو هەڵدەچێ، کەللـە ڕەقـە، ڕژدیـی زۆرە، توندوتـیژە....). جـۆری چـوارەم سـیمای ڕەش وەکـو (ڕەشبینە، گۆشەگیرە، غەمبارە، لەبیرکردنەوە لەسەرخۆیە....).

ئـەم جـۆرە دابـەش کـردنە لەسـەردەمی (هیـبۆکرات) ی یۆنـانی کـراوە تـا سـەردەمی ناوەڕاسـت پـێوەری (میعـیاری) کەسایەتی و ناسـینەوەی تاکـەکانی نـاو کۆمـەڵ بووە، بـەلاّم لـە نـێوان هـەردوو شـەڕی گـەورەی جـیهانی بەتایـبەتی دەزگـا سـیخوڕو هەواڵگرییـەکان بـۆ ناسـاندنی خـەڵك دەسـتیان کـرد بـە ڕووپێـوێکی دەموچاو لەسەر ئـەو بنچـینەیە وەسـفی تاکـەکانی نـێو دەزگا بایەخدارەکانـیان دەکـرد کـە سـێ جـۆر بـوون،یەکـەم دەموچـاوی چوارگۆشـەو پـان کـە سـیفەتی بریـتی بـوون لـە (سـادیزم،

شەڕاوی، سێکسیی زۆر، نائارام لەناو خێزاندا، کەللە ڕەق و تووڕە، چاونەترس (جبروت)، سەرکردەی هەڵکەوتووی سەربازی، هەڵچوونی زۆر، بەدەنێکی زل و گەورە، فیزلێدان و لووتبەرزی، دکتاتۆر لە مامەڵەی خەڵکدا.....). جۆری دووەم دەموچاوی سێگۆشەو چەناگە باریك سیفەتەکانی بریتی بوون لە (غەمبار، بێهوودە، گۆشەگیر، مات و سەرکز، ساردی سێکسی، ناهاوسەنگی لەگەڵ خێزان و کۆمەڵ، خۆبەزیرەکزان......)جۆری سێیەمیش دەموچاوی بازنەیی و ئاسایی وەکو (گران و سەنگینە، خۆویستە لەناو کۆمەڵ، دڵسۆزو بە بەزەییە، بەختەوەرە لە ژیانی خێزانیدا، حەزی لە لێکۆڵینەوەو دیراسەکردنە، حەزی لەکێشەو گرفت نییە، خۆی بە دڵە،بایەخ بە ڕێکپۆشیی خۆی دەدات حەزی لە خۆ دەرخستنە....)، بەلاّم ئەو سایکۆلۆجستانەی کە زیاتر باوەڕیان بە هۆکاری بۆماوەیی هەیە لەسەر کەسایەتی ئەوا خەڵکیان بەسەر دوو جۆری قەبارەو شێوە دابەش کرد، جۆری یەکەم قەڵەوو خڕو کورت، سیفەتی وەکو (تەمبەڵە، سارده لە سێکس، خۆش باوەڕە حەزی لە پارەیە، نوکتەچی و قسەخۆشە...) و جۆری دووەم لاوازو باریك و درێژ (کەللەڕەقە، هەستیارە لەشتی ورد، سێکسییە، زۆرزانە، زۆربلێیە، خۆپەرستە، بەرژەوندیی خۆی بەسەر خەڵك فەرز دەکات....)زۆر جاریش نامۆبوونی تاك خەسڵەتێکی فەلسەفی بوو،بەلاّم زۆر توێژینەوە ئەوەی سەلماند کە نامۆبوونی تاك لەسێ ڕەهەندی جیاواز سەردەگرێ ڕەهەندی (فەلسەفە، دەروونزانی، ئایدیۆلۆژیا). کاتێ مارکس و فەلسەفەکەی باس لە نامۆبوون دەکەن،ئەوا لەژێر دەواری هێزی کارو دابەش بوونی بەرهەم و پێوەندییەکانی لێکدانەوەی خۆی دەکات کەبە نامۆبوونی کار ناوی دەبات، بەلاّم لێکدانەوەو خورد کردنەوەی ئەم نامۆبوونە لە ڕوانگەی دەروونییەوە واتە شۆڕبوونەوە بە قوولاّیی ئاه و حەسرەت و مەیل و بۆچوون و ململانێی (ئەو و منی بالاّ) وپێداویستی ڕۆژانەو بێهوودەیی و ڕەشبینی....واتە میکانیزمی حاڵەتە دەروونییەکانی تاك. لێرەدا ململانێی دەروونی لەگەڵ هێزی بەرهەمهێنان و پێوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان یەك بگرێتەوە بە شێوەیەکی کاروکاردانەوە. لەڕووی



زانستییەوە دژە کەسایەتی (نامۆبوون) دەبێتە چەند بە شێك. یەکەم: نامۆبوونی فەسلەجی،کاتێك تاك لە دایك دەبێت کۆمەڵێك حەزو پێداویستی فەسلەجیی شاراوەی بەهێز کۆدەکرێتەوەو پێویستیان بە بەتاڵکردنەوەو ئاڵوگۆڕو تێرکردن هەیە کە کۆگای ئەم تێرکردن و بەتاڵکردنەوەیە گەورەترین بەشی کەسایەتییە کە پێی دەوترێت (ئەو)هەمیشە کۆنترۆڵی ئەم بەشە سەربەخۆو خۆنەویستە بەبێ گوێ دانە کات و شوێن ئەوا سەرهەڵدەدات داوای تێربوون و بەرلاّکردنی حەزو ئارەزووەکانی ناوەوەی دەکات کە تاك ئیرادەی بەسەردا نییە، بۆیە ئەگەر بەهۆی چەند فاکتەرێکی لاوەکی و چینگەیی لەلایەن منی بالاّوە سەرکوت کرایەوە و خنکێندرا،ئەوا تووشی داچەپین دەبێت دەبێتە وزەیەکی ترسناك بەسەر گەورەترین بەشی کەسایەتیی مرۆڤ، ئەوا ناچار (ئەو) ڕێگایەکی تر دەگرێتە بەر بۆ گەڕان بە دووای چێژ ئەویش نائاگایی مرۆڤە لە ڕێگای خەون و زیندەخەون و خەیاڵ کارەکان جێبجێ دەکات وحەزو ئارەزووەکان بەرەلاّ دەکات ئەوکاتە چێژی ڕاستەقینە ون دەبێت،مرۆڤ ناتوانێت مومارەسەی سەرچاوەی حەزو ئارەزووە فەسلەجییەکانی بکات بە واقیعی کاتێك پەنا دەباتە بەر خەون و خەیاڵ ئەمە دوور کەوتنەوەیە لە چێژی ڕاستەقینە بە تێگەیشتنی دەروونزانی، واتە نامۆبوونی فەسلەجیی جەستەیی،کە لەم پرۆسەیە کارە خۆنەویستییەکان بەسەر کارە خۆویستییەکاندا زاڵ دەبێت مرۆڤ ئەوکاتە جەستەی دەبێتە ئامێرێك بۆ تێرکردنی چێژە نائاگاییەکان.

جۆری دووەم: نامۆبوونی دەروونییە،کاتێك تاك بەهۆی هەندێ فاکتەری نەریتی دەوروبەر کە دەبنە ڕێگر لە بەردەمی خواستەکانی تاك و مەیل و بۆچوون و پێگەی کۆمەلاّیەتی و کەسایەتی ئەم کۆسپ و تەگەرەیە لەبەردەم خواستەکانی تاك و دەربڕین لە ناخەکانی خودی خۆی بەهۆی دابونەریت و ڕێسای کۆمەڵ، ئەوا تاك تووشی ون بوون دەبێت و هەست دەکات ناتوانێت بەشێوەیەکی دروست حەزەکانی خۆی و ئاوات و هیوایەتەکانی وەکو خۆی دەیەوێت گوزارشتی لێوە بکات، ئەوا

هەردەم لە دڵەڕاوکێ و پەشۆکاوی دەژیت، هەست دەکات جێگای نابێتەوەو دنیای لێ تەنگ بووەو هەست بە سستی دەکات، لە پێوەندییە خودییەکان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و تاك ناتوانێت لەکێرڤی نامۆیی دەروونی هاوسەنگی دروست بکات، هاوژیانی لەگەڵ دەوروبەرو ژینگە بدۆزێتەوە، بۆیە بەردەوام تاك هەست بە نەخۆشیی دەروونی دەکات و گەلێ جار ناتوانێت هاوسەنگیی ئەو هاوکێشە کۆمەڵایەتییە بکات کە دەڵێ نە من لە ئێوە تێدەگەم نە ئێوە لەمن تێدەگەن، ئەو کاتە لە دەوروبەر دوور دەکەوێتەوە کە بە کۆمەڵگایەکی سەلبی دادەنێت و کۆمەڵگا بە سەربازگە دەشوبهێنێ وەکو دەزگایەکی سەرکوت کردنی حەزو ئارەزووەکان و داچەپاندنی مەیل و بۆچوونی کە ناتوانێت لەم سەربازگەیە گوزارشت لە بۆچوونەکانی خۆی بکات، بۆیە هەست بە نائارامگیری دەکات لە حاڵەتێکدا کە دەروون نەخۆش دەبێت یان دوور دەکەوێتەوەو گۆشەگیر دەبێت لە هەموو چالاکییە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ژینگەی سست دەبێت و دەوری نابێت یان بۆ دەربازبوون لەو حاڵەتە دەروونییە ئەوا لادەر دەردەچێت و نەشاز هەڵسوکەوت دەکات کە لەگەڵ دەوروبەر ناگونجێت و دەبێتە جێگای سەرنجی کەسانی تر و لەگەڵیان ناژیت، لە هەردوو حاڵەتدا لەم گێژاوەدا خۆی ون دەکات کەسایەتیی ون دەبێت.

سێیەم: نامۆبوونی کۆمەڵایەتی بەهۆی ئەو یاسا توندو کۆنەوە دەبێت یا بەهۆی دابونەریتی نەگونجاو لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم هەرکاتێك تاك نەیتوانی کاری گونجاو بدۆزێتەوەو جێگای خۆی دیاری بکات لەناو کۆمەڵ بەپێی بەهرەو تایبەتمەندی کاری بۆ نەدۆزراوە، ئەوا خۆی لەناو کۆمەڵێك ون دەکات و کارێك کە لەگەڵ خواست و ویستی ئەو ناگونجێت تەنیا بۆ ڕازی کردنی کۆمەڵ و خەڵکانی دەوروبەری کار دەکات بۆ ئەوان دەژیت و بۆ ئەوان بیردەکاتەوە، دەبێتە لیسۆك لە دەستی کۆمەڵ و ئەسیری دابونەریت و یاسای کۆمەڵ دەبێت، کە دەخرێتە نێوان دوو بەرداشی نەجوولاو، ئەمەش بە ئامێری بوونی خۆی دەبێت و ناتوانێت لە ڕێگای چالاکییەکانی کۆمەڵایەتی و بزاڤی ڕۆشنبیری دەورببینێت و گوزارشت لە هەڵچوون و پاڵنەرەکانی خۆی بە ئازادی بکات، ئەمەش خنکاندنی وشەو دەربڕینی ئازادە لە



لایەن تاك کە خودی تاك هەست بە خەفەقان و فەوتاندنی دەکات کە هەمیشە پرسیاری ئەوە دەکات بۆ کێ دەژیم؟ بۆ کێ دەمرم؟ بۆ کێ دەخۆم وکاردەکەم.... من خاوەنی خۆمم!دیاری کردنی کەسایەتیی خۆم بەدەستی کێیەو خاوەنی بەرهەم و پێوەندییەکانی خۆمم ئەوکاتە لە دابونەریت هەڵدەگەڕێتەوە، دەیەوێ بۆخۆی بژیت و ساتە خۆشییەکان بدۆزێتەوە، بەلاّم فشاری کۆمەڵ ئەوەندە بەهێزە ناتوانێت بەرامبەر ئەو شالاّوە خۆی ڕابگرێت ون دەبێت، لەجیاتی ئەوەی بۆ خۆی بژیت ئەوا بۆ کۆمەڵ دەژی و دەمرێ، ئەمەش نامۆبوونەو ئەنتی کەسایەتیی کۆمەڵە. واتە توندنەوەی خودی تاکەکەس لەناو کۆمەڵ لەم حاڵەتەش گیانی داهێنان و دروست کردن دەکوژێتەوەو ململانێی تاکەکان لە پێناو گۆڕانکاری و پێشکەوتن کز دەبێت، هاندان و ورە بەرزی بۆتاك نابێت.

چوارەم: نامۆی فیکری. بەپێی سایکۆلۆژی واتە دوور کەوتنەوە لە عەقڵییەتی ڕاستەقینە و میسۆلۆژیای بیرکردنەوەوتێکشکاندنی ئیدراکی مەعریفی لای تاك کاتێك مرۆڤ ئینتیمای فیکری ون دەکات و پێوەرەکانی کەسایەتی سەرەوژێر دەکات، نامۆیی هزری دوورکەوتنەوەیە لە جەوهەری ئایدیای مرۆڤایەتی، کاتێك تاك بە عەقڵێکی تر بیردەکاتەوە یا لەخزمەتی بەرژەوەندیی توێژێك بیردەکاتەوە کە سەرخانی ئەو توێژە دەبێتە چاوبەستی خودی مرۆڤایەتی بۆ زیاد بوونی هێزی کارو قازانجی ئەو، واتە فرەوانکردنی سنوورەکانی هزری دەستەڵات و لادان لە ناوەرۆکی بیرکردنەوەی مرۆڤ بۆ بەرژەوەندیی خۆی وەکو ((فیورباخ)) دەڵێ، هێزێکی فیکریی شاراوە زاڵ دەبێت بەسەر دەستەڵاتی مرۆڤ، ئەوکاتە ئەنتی کەسایەتی دەبێت تەنیا بە ئازادیی هزری دەتوانێت ئەم دەستەڵاتە تەبەنی بکات. لە کۆتاییدا سایکۆلۆجستەکان دەڵێن، نامۆیی تاك کێشەیەکی تایبەتە بەسەردەم و لە جیهاندا چەندین توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، هەر زاناو هزریارێکە بیروبۆچوونێکی تایبەتی و هێڵێکی تایبەتیی هەیە بۆ شیکردنەوەی دیاردەی نامۆیی، بەلاّم سەرئەنجام لەگەڵ زۆریی جۆرەکانی نامۆیی و نامۆیی سەرەتاو هۆکاری خۆی هەیە بە گشتی واتە خزینی مرۆڤ لە شتێکی باو یا مرۆڤ هەست بکات

ئەوەی ناومێشکی خۆی لە بارودۆخەکەوە دەوروبەر جیایەو کەس نییە بەدیهێنەری مەبەست و حەزەکانی بێت و ناتوانێت کۆمەڵ بگۆڕێت، لە کۆتاییدا خۆی بە فاکتەرێکی نەشاز دەزانێت و تووشی نشوستیی فیکری و دەروونی دەبێت بە ناچاری گۆشەگیری هەڵدەبژێرێت و نامۆ دەبێت هەر لە مارکس و دۆرگهایم و هیگڵ و فیورباخ و فرۆید... چەندان کەسی تر باسی نامۆبوونیان کردووە، بەڵام مەبەستی ئەکادیمی ئەوەیە نامۆیی ئایا خەسڵەتی تاکە و دژە کەسایەتییە لە ڕووی دەروونییەوەو دەتوانین نامۆبوون لە جیهانی تایبەتی مرۆڤ بگۆڕین یاخود لە کۆمەڵگا کاتێك تاك هەست دەکات هەموو دەوروبەرەکەی فێڵی لێ دەکات و ڕووپۆش و ماسك بەکاردەهێنێ ڤاری (درۆزن) دەبێت، ئەوا گومان لە خۆی و بوونی خودی خۆی پەیدا دەکات وگومان یەکەم تێکشکێنەری یەقینە لە تاك و بۆکەسانی تر، گومان بەدحاڵیبوونە لە دەوروبەرو دژی هاوسەنگییە ئەگەر لە گومانماندا دەرنەچووین و نەگەیشتینە یەقین ڕۆحە تێکشکێندراوەکان زیاد دەکات، ئەوکاتە نامۆ لە تاکەوە دەبێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی...

# جەبری دەروونی

هەموو جیهان لە ڕووی فەلسەفەی زانستییەوە بەپێی سیستەمێکی دیاریکراو کاردەکەن، کەهارمۆنیایەك دەبەخشێتە بوون. بچووکترین پێکهاتەش لەم گەردوونە یەکەی پێوانەیە بۆ شیکردنەوەی ماددەکان. لە گلۆی ئەم سروشتەدا کاتێك مرۆڤ بەشێك بێت لەم سروشتەدا ئەوا بێشك بەشێکە لە ئالیەتی دروست بوونی ئەم سیستەمە،بۆ بردەوام بوونی ژیان یەکەی سیستەمێك لەئارادا هەیە کە خودی مرۆڤ وەکو بەشێك لە ماددە دەگرێتەوە. خوردبوونەوە لە پێکهاتەیەکی دەوروبەر دەبێ بگەڕێینەوە سەر یەکەی پێوانەیی بۆ بەراورد کردن و دانانی بەرنامەی کاری ئیشکردن و بەڕێوەچوونی. ئەگەر مەترو ئەوانی بچوکتر یەکەی پێوانەی ژمارەی



درێژی بێت و گرام و بچووکتریش لەو یەکەی پێوانەی کێشان بێت و ڕۆژو مانگ..ئەوانی تر یەکەی پێوانەی مێژوو بێت، ئەی یەکەی پێوانەی دەروونی چییە؟ چۆن دەتوانین پێوەری ئەم جیهانە دەستنیشان بکەین و بە چ سیستەمێك و یاسای کار ئەم ڕووبەرە فراوانەی ناوەوەی ئادەمیزاد کار دەکات و ڕەوشتی دێتە بوون. ئەگەر هەموو شتێك تەنانەت ژیانی بچوکترین بوونەوەر پێوەرو سیستەمێکی ماتماتیکی هەبێت، ئەوا جەبری دەروونی بەپێی وردترین ژمێری و یەکەی ماتماتیکی کار دەکات بۆ دروست بوونی هارمۆنسای دەروونی و پەیدا کردنی هاوسەنگی و هاوگونجانی تاك لەگەڵ یەکەم: خودی خۆی. دووەم: لەگەڵ دەوروبەر. سێیەم: هاوسەنگیی نێوان ژیان ومردن. لە بونیادی پێکهاتەی ماددەکاندا پێوانەیەك هەیە بۆ بەراوردکردن و دروست بوون و بەردەوامیی ماددەکان و لە دەروونزانیشدا پێوانەیەك هەیە بۆ بەراوردکردنی ڕەوشتەکان و دیاریکردنی چۆنیەتیی جۆری باری سەرهەڵدانی ڕەوشت و پێوانە لە نێوان دوو کەس و ڕادەی کاریگەریی ڕەوشتەکان لەسەر یەکترو دەستنیشان کردنی دەروون نەخۆش لەگەڵ کەسی ئاسایی، چۆنیەتیی پێوانەی کەسایەتیی و میزاج و تاوگیری هەڵچوون و پلەی زیرەکی و هەڵسەنگاندنی خودی تاك لە نێوەندی ژینگەو چۆنیەتیی دروست بوونی هاوسەنگی و خۆگونجاندن و دەستنیشان کردنی سەرکردەو ڕابەرو کەسی جەربەزەو ترسنۆك بەپێی پرنسیپەکانی سایکۆلۆژی و فەسلەجی ئەوا چەندین ژمارەو پێوانە و پێوەر دانراوە وەکو سیستەمێك بۆ ئالیەتی کارکردنی کۆ ئەندامی دەروونی کە بەپێی چەند یاسایەکی ماتماتیکی لێکدانەوەی بۆ دەکرێت پێی دەوترێت جەبری دەروونی واتە پێوەری دەروونی کە بریتییە لە پێوانەی دیاردەی ڕەوشت و گەیشتن بە ڕادەی چەندایەتی و چۆنایەتیی ئەو ڕەوشتە ئەویش پێوانی تایبەتمەندی دیاریکراوی ڕەوشتە و ئامانج لە جەبری دەروونی بریتییە لە دۆزینەوە و ناساندنی یاسایەکانی کە کۆنترۆڵی ڕەوشتەکانی تاك دەکات وسوود وەردەگرێت لەم یاسایانە و بەکارهێنانی لەپێناو بەرژەوەندیی تاك و کۆمەڵ و ئامانجێکی تر دۆزینەوەو

ئاشکراکردنی جیاوازیی نێوان دەروونییەکانی تاکەو پێوەری دەروونی کۆمەڵێك ڕێکخستنی ڕەوشتی دەگرێتەخۆ کە بۆ پێوانەی خۆی جۆرەها هۆکار بەکاردەهێنێت کە هەموو ڕەهەندە جیاوازەکانی ڕەوشتی دەرچوو لە تاك دەگرێتەوە، ئەمەش کۆمەڵە کردارێکە لە شوێن و کاتێکی دیاریکراودا، چونکە ڕەوشتی تاك ڕەوشتێکی زیندووە لە ئەنجامگیریی ئەو کردارە ماددی و دەروونییەوە دەبێت و مەبەستمان لە کردارە ماددییەکان وەکو جووڵانەوەو هێزو کارلێکە کیمیاوییەکانی لەش، بەڵام کردارە دەروونییەکان کە تاك دەریدەبڕێت لە ئەنجامی لێکخشاندن و هەڵوێستە کردن لەگەڵ دەوروبەر کە ناتوانین لێکدانەوەو ڕاڤەکردنێکی ڕووتی ماددیی بۆ بکەین و بیخەینە ڤاڵبی هاوکێشەیەکی نەگۆڕ، چونکە تاکەکان لە هەموو ڕووییێکەوە لێك جیاوازن تەنانەت لەگەڵ خودی خۆیان دەگۆڕێن بەپێی کات و شوێن. ئەم کردارانەش وەکو مەیل و حەزەکان و بیرکردنەوەو بیرهاتنەوە و زاناندن...هەموو پەرچەکردارێکی دەروونیی جیاواز پێوەرێکی سەربەخۆو گۆڕاوی هەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت پێوەری دیاردە ماددییەکانی تاك ڕاستەوخۆ دەتوانین بیکەین لە ڕێگای چەند یاسایەکی وەرزشی – ماتماتیکی، بەڵام دیاردە ڕەوشتییە دەروونییەکان دەبێ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بێت، چونکە دیاردە دەروونییەکان پێکهاتەی گۆڕوی ئەگەری مرۆڤن لە ڕێگای چاودێری و تێبینی کردن وتاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندن دەبێت ئەمەش ئالیەتێکی فرەوان و کاتێکی زۆری دەوێت، بۆ دڵنیابوون لە ئەنجامی کۆتایی. بۆ نموونە کاتێك پێوەری زیرەکیی تاك دەکەین دەبێ ئەوکەسە چەند تاقیکردنەوەو ئەزموون لە قۆناغی جیاواز ببڕێت لە ژینگەیەکی گۆڕاو بەراورد بکرێت لەگەڵ کەسانی ترو لە هەموو ئەو خاڵە لاوازانە لێك بدرێتەوە لە کۆتاییدا هەموو ئەگەرەکان کۆبکرێنەوە بگەینە ئەنجامی کۆتایی و پلەیەك دەستنیشان بکرێت بۆ زیرەکی ئەو کەسە. پێوەری دەروونی دەستەواژەیەکە بۆکۆمەڵێك ڕێکخەری ورووژێنەرەکان لە ڕێگای چەندایەتی و چۆنایەتی دانراوە بۆ پێوانی پرۆسە کردارییەکانی مێشك و سیمایەکانی کەسایەتی



و تایبەتمەندییەکانی دەروونی، ئەمەش ڕێگایەکی بابەتی و ئەکادیمییە بۆ دەستنیشان کردنی و پۆلێن کردنی ڕەوشت و کەسایەتی تاك، ڕەنگە ئەو ورووژێنەرانە پرسیاری زارەکی و سەرکاغەز بێت (شفهی و تحریری). یان زنجیرە شێوەو قەبارەی ئەندازەیی بێت یا چەند ئاوازێك و میتۆدێکی مۆسیقا بێت و لەوانەیە هێماو نەخش و نیگار و شێوەو وێنە بێت، ئەمانە هەمووی تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی تاکن. واتە ئەوەی پشکنەری دەروونی دەیکات هەمان کرداری کیمیاگەرانە کە لە تاقیگە دەیکەن،ئەگەر سایکۆلۆژستێك ویستی پێوەری گەشەی زمان بکات ئەوا تێبینی ژمارەیەکی دیاریکراوی وشە و دال و مەدلوول دەکات چەند جارێك بە جۆرەها شێوە تا دەگاتە دەرئەنجامی کۆتایی، ئینجا پلەیەکی بۆ دادەنێت. واتە جەبری دەروونی جۆرێکە لە بەراوردکاریی ژمارەکان لە نێوان کرداری ڕەوشتی لە شێوەی دوو پرۆسەدا.

یەکەم:پرۆسەی ژمارە لە ئەنجامی بەراوردکردن بەپێی هاوکێشەی ماتماتیکی لە دوو تاقیکردنەوەی ڕەوشتی جیاواز دەست دەکەوێت بەدانانی نمرەیەك یا ژمارەیەك کۆتایی دێت.

دووەم:کرداری بەراوردکردنی تاقیکردنەوەکان لەنێوان خودی تاکە کەس بە پێی کات و شوێنی گۆڕاو یا لەگەڵ کەسێکی تر کە هەمان تاقیکردنەوەی لەسەر کراوە، مەبەست لە پێوانەی دەروونی بریتییە لە دەرخستن و ئاشکراکردنی هەموو جیاوازییەکان لەنێون تاك لە ڕووی پەروەردەو دەروونی و پیشەیی و عەقڵی و جیاوازی لەنێوان خودی تاك لە ڕووی زانینی هێزو لاوازیی کەسایەتیی تاك بەپێی ورووژێنەرەکان و غەریزەکان و جیاوازیی لەنێوان پیشەو توانای تاك بۆ ئەوەی کەسی شیاو لە شوێنی گونجاو دابنرێت و هاوسەنگی لەنێوان توانای خودی تاك لەگەڵ ئەو پیشەیەی بۆی دەستنیشان دەکرێت دابنرێت و جەبری دەروونی جەخت لەسەر جیاوازی لەنێوان گرووپەکان و نەتەوە و دەوڵەتەکان دەکاتەوە و سنوورێکی

ماتماتیکیان (ژمێری) بۆ دادەنێت، ئەمەش خزمەتێکی زۆرمان دەکات بۆ ڕیز بەندی و پۆلێن کرنی کەسایەتییەکان و پیشەییەکانی لەناو کۆمەڵدا.

تایبەتمەندیی جەبری دەروونی بریتییە لە:

یەکەم: پێوەری دەروونی چەندایەتی،ئەمە ڕەهەندێکە لە ڕەهەندەکانی ڕەوشت بۆ دانانی نمرە کە گوزارشت لە کێرڤی ئاستی تاك دەکات وەکو ئاستی قوتابی لە خوێندن و ڕادەی زیرەکی.

دووەم: پێوەری ناڕاستەوخۆ،واتە ئەو پێوەرانەی ڕەوشت و کەسایەتی دەگرێتەوە کە کۆمەڵێك ئەگەر (فرچیات) ی هەیە ناتوانرێت ڕاستەوخۆ دەستنیشان بکرێت، پێویستی بە چەند تاقیکردنەوەیەك هەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجی کۆتایی.

سێیەم: جەبری دەروونی ڕەها نییە، بەڵکو ڕێژەییە بە بەراورد لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی ماددی،چونکە ئەوان[١٥]سفری ڕەهایان هەیە کە ماددییەتی کیمیایی لەگەڵ ماددەیەکی تر نەگۆڕە یان ژمارەیەك لەگەڵ یەك دەکاتە دوو، بەلاّم لە دەروونزانی هەموو تاقیکردنەوەکان ڕێژەیین بەپێی کات و شوێن و توانستی ئەوکەسە دەگۆڕێت،لەبەر ئەوەی ڕەوشت گۆڕاوێکی دیاریکراوی کەسایەتیی تاکە، ئەوا پێوەرەکانیش دەگۆڕێن، بەلاّم پێودانگی ئەم کردارە جەبرییە نەگۆڕە، کە لەژێر ڕۆشنایی ئەو پێودانگە بەراورد دەکرێت.

چوارەم:پێوەری دەروونی هۆکارێکە نەك ئەنجام مەبەست لەم پرۆسە پێوەرییە تەنیا تێگەیشتنە لە ڕەوشتی تاك.

پێوەری دەروونی و پەروەردەیی وەکو بزوتنەوەیەك بەردەوام بوو لە یەکەمین سەرهەڵدانی پێوەری زیرەکی لایان (ستانفۆرد بینیێ) لە ساڵی (١٩٠٥) کەپشت بە تاقیکردنەوەو پێوەری دەبەستێت کە پێویستی بە چالاکیی زانینی عەقڵی هەیە وەکو تواناو ئامادەیی هزری و بیرکردنەوەو بیرهاتنەوەو زیرەکیو باشترین شێوازی پێوەری دەروونی کە پشت بە تاقیکردنەوەی نوێ دەبەستێت کە بریتییەلە تاقیکردنەوەی تەرازوو(CRT) لەم حاڵەتەدا خودی تاك دەبێتە بەراوردی پێوەری خۆی نەك بەراوردکردن لەگەڵ کەسێکی تر. واتە تاك خۆی تەرازووی هەڵسەنگاندن



و پێوەری ڕەوشتەکانی خۆی دەبێت بە پێی کات و شوێن.زۆر هۆکاری پێوەری دەروونی هەیە باشترینیان بریتییە لە، ڕووپێوکردن، ڕاوەرگرتن، دیداری کەسایەتی، تێبینی کردن و ئەنکێتی ئیستبیانی... بۆمان دەردەکەوێت جەبری دەروونی بزوێنەرو سەلمێنەری زانستییانەی دەروونزانییە لەسەردەمی هاوچەرخ کە دەتوانرێت دەروونزانی مامەڵە لەگەڵ ژمارەکان بکات لە ڕێگای هاوکێشەی ماتماتیکی وەلاّمی وروژێنەرەکان بداتەوە.

## سەرچاوەکان


١-فؤاد أبو حطب وسيد عثمان-التقويم النفسي، القاهرة-مصر (١٩٧٣).

٢-رمزية الغريب-التقويم و القياس النفسي و التربوي، القاهرة-مصر (١٩٧١).

٣-جابر عبدالحميد جابر- مقياس التفضيل الشخصي، دارالنهضة العربية- القاهرة (١١).

٤-سيد غنيم هدى برادة-الاختبارات الاسقاطية- القاهرة، دار النهضة العربية (١٩٦٤).

٥-فؤاد البهي السيد- علم النفس الأحصائي —دار الفكر العربي، القاهرة (١٩٨٠).

١٥٢

## فیزیای دەروونی

ئەگەر بەردێك فڕێ بدەینە ناو ئاوێك، دەبینین بەپێی قەبارەو هێزی فڕێ دانی بەردەکە، شەپۆل دروست دەکات و سنوورەکانی فرەوان دەبن.هەموو شتێك بەپێی کات و شوێنەکە لە فەزای سروشت شەپۆلی هەیە، چونکە کاتێك بەردەکە فڕێ دەدەین، ئەوا میکانیزمی شەپۆلەکانی دەگۆڕێت، واتە بە گۆڕینی کات و شوێن، شەپۆلەکانیش لە فەزای گەردوون دەگۆڕێن و مرۆڤیش ئەگەر بەشێك بێت لە پێکهاتەی سروشت، لە بۆشاییدا قەوارەی هەیە و شوێنێك لە زەمەنێکدا داگیر دەکات و بەپێی هاوکێشەی فیزیای دەروونیی (کات و شوێن)ی ژینگە.

تاك شەپۆلێکی تایبەتی هەیە بەپێی کاریگەریی کەسایەتی و ڕۆشنبیری و ڕەوشتە خەسڵەتیپێکهاتەی و هزرو بیرکردنەیوە و هەڵچوون و غەریزەکان بەپێی ڕادەی هێزو توانای ئەو فاکتەرانەی کە پێناسەی تاك دەکەن، شەپۆل لە بۆشاییدا دروست دەکات و شەپۆلی گەورە دواتر چەندانی بچووکتر لە یەکتر بەپێی ڕیزبەندیی شەپۆلەکان،هەروەها لەتاکدا چەندان بواری فیزیای دەروونی هەیە کە هەموو



بوارێك بەپێی لێکدانەوەی فیزیایی بوونی کات و شوێنیان هەیە و کاریگەری لەسەر خودو دەوروبەر هەیە. وەکو دەروونی و کۆمەلأیەتی و ئابووری... وکۆمەڵەی گشتالتەکان (ورتایمر و کوهلەر و کوفکا) لە بۆچوونەکانیان، فیزیای دەروونی بە ئامانجێکی نزیك دەبەستنەوە کە چەند ئامانجێکی کاتی لە بۆشایی تاك سەرهەڵدەدات بۆ وەدەست هێنانی ئامانجی گەورە، ئەویش پێکانی گۆڕانی ڕەوشتی تاکە لە بەرانبەر گونجاندنی ژینگە، بۆیە هەر کەسێك ژینگەی ماددی بگۆڕێت، ئەوا بواری کەسایەتی و ڕەوشتیشی دەگۆڕێت و بە پێچەوانەوە ڕاست نییە، واتە بەپێی لێکدانەوەی سایکۆلۆژستە ماددییەکان، ڕەوشت ڕەنگدانەوەی حاڵەتە ژینگەی ماددی تاکە،ڕەوشت و ڕەفتارەکان بەسەر خانی حاڵەتە عەقلگیری تاك دەچووێنێت، بەڵام ژینگە و پێکهاتەی فیگەرە گۆڕاوەکانی سروشتی ژینگە بەژێرخان و بناغەی پێکهاتەی کەسایەتی دەچووێنێت هەموو پێکهاتە وردکارییەکانی ڕەوشت دوو دیوی لە عەقلگیری ئێمەدا هەیە،پۆزەتیڤ و نەگەتیڤ کە بەپێی لێکدانەوەی فیزیاویی دەروون،مرۆڤەکان دوو لێکدانەوە و ڕاڤەکردنیان هەیە بۆ پێوەندییە کۆمەلأیەتییەکان و ئابوورییەکان و ڕۆحییەکان کە بونیادی کەسایەتیی خۆیان لەسەر دروست دەکەن، ئەویش عەقڵی واقیعی لاوازە لە بەرانبەر حەزەکان و ئارەزووەکان،لەگەڵ عەقڵی ناوەوەی نائاگا کە لە بەرانبەر حەزەکان و ئارەزووەکان بەهێزە، چونکە بواری عەقڵی ناوەوە، فرەوانترە و سنووری نییە، لەژێر هەموو جازبییەکی دەوروبەر دەردەچێت و لە فەزایەکی سەربەست مەلە دەکات و بیردەکاتەوە، بێ ئەوەی ڕەهەندەکانی یاساو دابونەریت و ژینگە دروست بوونی تاك بەهەند وەربگیرێت و ڕاڤە و هاوتای بکات لەگەڵ حەزەکان بەپێی بەرژەوەندییەکی یەك لایە کار دەکات،تەنیا بەدوای چێژەکان واقیعی بن یا وەهمی دەگەڕێت، بەڵام ئەوەی یەکەم وەکو ماددەکان تەنیا لەگەڵ فیگەرە هاوتایەکانی خۆی مامەڵە و سەودا دەکات و لەگەڵ هیچ لەوانی تر مامەڵەو ئاڵوگۆڕو تێکەڵاوبوونی نییە، وەکو هەڵوەشانەوە و پێکهێنانی خێزان و هاوڕێیەتی و هاوفیکری. سروشتی تاك وا

هەڵکەوتووە تەنیا ئەو ژن و پیاوە یەکدەگرن کەوا لەکایەی دەروونی و فیزیای جەستەیی وردەکارییەکان یەکدەگرن.

دەتوانن بەردەوام بن ئەگەر پێکهاتە و فەزای دەروونیان هاوشێوەیان بێت، ئەگەر فیزیای دەروونی بەمانا فرەوانەکەیەوە لێکبدەینەوە هاوشێوە نەبوون و ناتەبابوون، ئەوا دژایەتیی یەکتر دەکەن و لەگەڵ یەکتر ناگونجێن، تەنانەت لەیەکتر دوور دەکەونەوە و لەگەڵ یەکتر ناسازێن. سایکۆلۆژستەکان دەڵێن: ئەگەر کۆمەڵە تاکێك بەیەکەوە بن حاڵەتی بەرهەم هێنان و پێوەندی خوێن و خزمایەتی کۆیان بکاتەوە، ئەوە تەنیا چەند جووتێك لە کەسەکان زیاتر دەچنە ناو یەکترو دەسازێن و خۆشبەخت دەبن لەگەڵ یەکترو لەیەکتر دانابڕێن، چونکە بوارەکانی دەروونی و فیکری دەچێتە ناو یەکتر، یەکتر قەبووڵ دەکەن، بۆیە لەو هەموو ژنە یا پیاوە، تەنیا ژن و پیاوێك دەتوانن زەماوەند بکەن و خێزان دروست بکەن و بەهەمان شێوە دوو هاوڕێش یەکتر هەڵدەبژێرن، جا چ لەکایەی دەروونی بێت یا فیکری یان سیاسی یا ئابووری و کاتێك بوارە فیزیاییەکان کارلێك کردنیان تەواو بوو ئەو وزەیە نەما کەبەیەکەوە دەیانبەستێتەوە، ئەوکاتە وزەی دەروونیش نامێنێت و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ڕۆحییەکان و بەرژەوەندییەکان لەپاڵ یەکتر هەڵدەوەشێتەوە.

کورت لیفین (١٨٩٠-١٩٤٧) تەرکیزی لەسەر پاڵنەرەکان و حەزەکان و ئامانجەکان دەکردەوە و ڕادەی پێوەندی بە کەسایەتیی تاك، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی ڕەوشتی کۆمەڵی و چەمکی کایەی دەروونی یان فیزیای بریتییە لە بواری زیندەگیی تاك، واتە سەرتاپای ڕاستیەکانی تاك کە ڕەوشتی دیار دەکات، لە هەڵوێستێك لە کاتێکی دیاریکراودا، ئەو بوارە فیزیاوییە بریتییە لە خودی تاك و ژینگەی ڕەوشتی خۆی کە هەموو ئەو فاکتەرانە دەگرێتەخۆ کە کار لە ڕەوشت دەکات و ئامانجی سەرەکی بریتییە لە هێزی کاریگەرو پۆزەتیڤانە کە هەوڵی بۆ دەدات و هێزی زیادو ناڕێك و نەگەتیڤ کە خۆی لێ دەرباز دەکات، وەکو هەموو کارێکی دەرهاویشتن لە مرۆڤ و خۆ بەتاڵ کردنەوە لە بەرانبەر کردەوە ناشیرینەکان. هەموو ئەو فاکتەرانەی کەوا دەبنە هۆی برینداركردنی خودی کەسایەتی، واتە لادانی بواری



نەشاز لەخودی تاکدا، چونکە ئەو بوارە فیزیاوییانە ڕێگرن لەبەردەم تاك بۆ گەیشتن بە ئامانجی کۆتایی کە نەخشەی تاکە لە پێناویدا تێدەکۆشێ و (لیفین) دەڵێ: تاك لە کۆمەڵە بوارێك پێکهاتووە کە ڕەنگە بواری ماددی مەلموس نەبن، تەنیا چەند بوارێکی هەستی و دەروونی بن، تەنیا تاك بۆ خۆیان دروستیان دەکات، وەکو وزەیەکی شاراوە تاکو مامەڵە لەگەڵ خودی خۆی و دەوروبەری بکات. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەو فاکتەرو بابەتانەی کە دەبنە هۆی بونیادی کەسایەتیی تاك، ڕەنگە لە واقیعی بووندا هەستیان پێ نەکەن، بەڵکو لە دەرەوەی ئیدراك و بیرکردنەوەو ئاگای ئێمەبن، هەر چەندە بوونێکی کاریگەریان هەبێت یا ماددی یا نزیکایەتیی جوگرافییان لەگەڵ تاکدا هەبێت، بەڵام ناتوانن بچنە بوارێکی بونیادی کەسایەتی و سنووری ڕەوشت لەتاکدا و هەندێ جار بواری فیزیاوی تاك بوونێکی کاریگەرو ماددی نییە، تەنیا لە ئائاگاوە کۆمەڵێك لێکدانەوە و تێکەڵ بوون و پێکهاتەی بوارەکان هەیە، لەگەڵ ئەوشدا کاریگەرو بزوێنەری ڕەوشتی تاکە و ڕێڕەوی کەسایەتی دەگۆڕێت و دەبێتە بوارێکی گرینگ لە ژیانی تاکدا.

دەتوانین لە ڕێگای هێڵکاریی جوگرافیای دەروونی (تۆپۆلوجی دەروونی) سنوورەکانی بواری ژینگەی دەرەکی و ناوەکی تاك دیاری بکەین، لەگەڵ سنوورەکانی بواری واقیعی و وەهمیی تاك وەکو ئەوەی کەسێك بوونی ماددی لە جێگایەك هەبێ، دەتوانێ ڕاستەوخۆ ژینگەی ئەو بوارە دیاری بکات و تێیدا کاریگەر بێت لەبەرانبەر بواری وەهمی کە کەسێك لە شوێنێك بوونی ماددی نییە، تەنیا شتێکی موڵکی خۆی یا ناوی لەو شوێنە دادەنێت، واتە لە ون بوونی خۆی بوارێك داگیر دەکات، هەموو بوارە دەروونییەکان دوور لە بوونی ماددیی خۆی کاریگەر دەبێت بەسەر ئەو ژینگەیە یا وەکو کەسێك کۆڕێکی ماتەمینی بۆ دەگێڕدرێ بوونی ماددی واقیعی نییە، بەڵام فەزایەکی دەروونی و هزری لەو ژینگەیە و لە دەرەوەی ئیدراك و ئاگای ئامادەبوونی ماددی ئەوێ داگیر دەکات.



## تاك

پێكهاتی ئامانج گۆڕانی

ڕەوشتی ماددی وەهمی

### بواری گشتی تاك( فەزای فیزیای تاك)

بواری تاك دوو كۆمەڵە هێز دەگرێتەوە،هێزی پێگەیشتوو لە ژینگەی دەرەكیی دەور دراوی خود و كۆمەڵەی دووەمی هێزی پێگەیشتووی ناوەوە لە خودی خۆیەتی لە نواندنی ئەو هێزە و ئەو هێلكارییەی بواری كەسایەتی، بایەخ بەشێوەو قەبارەی فرەوان و دووریی نێوان بوارەكان نادات،بەڵكو بایەخ بە هێڵی سنوورەكانی نێوان ناوچەكانی دەروونی دەدات،لەگەڵ ئەو جیاكارییەی كە دوو ناوچە لێك جیادەكاتەوە.هەر بۆشاییەكی فیزیایی بۆشاییەكی تر بەدوای خۆیدا ڕادەكێشێ كە دەبێتە زنجیرەی پێكهاتەی كەسایەتیی تاك كە هەموویان لە فەزای فیزیای گشتی كۆدەبنەوە و خەسڵەتێكی تایبەتیی گەردیلەیی دەبەخشن بەتاك، بۆیە بەهیچ شێوەیەك دوو میزاج لە یەك ناچن و نابنەوە ئەنگلۆسازی یەكتر، وەكو چۆن دوو پەنجە مۆر لە یەكتر ناچن و بە پەنجە مۆرەكان دەتوانین كەسەكان بناسینەوە، بە هەمان شێوەش دەتوانین، بەهۆی خەسڵەتی بواری دەروونی، كۆنووسی ڕەفتاری تاك بزانین. هەموو ئامانجی (كورت لیڤین) ئەوە بووە كە چۆن ژینگەی خودو ژینگەی دەرەكی، هاوسەنگ و گونجاو دەبن. لیڤین باس لەوە دەكات، تاكە هۆكار بۆ دەستەبەركردنی پرۆسەی گونجان لەنێوان خودو ژینگەی دەرەوەی تاك، بریتییە لە كارایككردن لەنێوانیان، لە ڕێگای پرۆسەیەكی ئیدراكی. ئیدراك لای لیڤین و گشتالتییەكان،خاڵی سەرەتایی ئەو كارلێكە لە نێوان خود و هەڵوێست و لەنێوان خود و بواری ڕەوشتی و فەزای زیندووی تاك، ئەو ژینگەیەیە كە خودی تاك خۆی دەیبینێ و تایبەتە بە خۆی، نەك وەكو خەڵكی دەوروبەر دەبینێت.





بواری تاك كۆمەڵێك ئایتمی بزوێنەر بەخۆیەوە دەگرێو وەكو هێزی پۆزەتیڤ كە بریتییە لە پاڵنەرەكان و غەریزەكانی كە پارێزگاری تاك و جۆری تاك دەكەن. بۆ نموونە پێداویستیی تاك بۆ خواردن و نووستن و سەنتەری دەوری كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری.. جۆرێكی تر هێزی نەگەتیڤ وەكو ترس و شەرم و لاوازیی توانای زیرەكیی و بەدەنی و هێزی پاڵپشتی ماددی یان مەعنەوی، وەكو دەرچوون لە تاقی كردنەوە و چاك بوونەوە لە نەخۆشی و هەژاری و گەیشتن بە ئامانجێكی دیاریكراو و چاك بوونەوە لە نەخۆشی و هەژاری و لەدەست دانی ئامانجێك و ئامانجێكی تر خستنە شوێنی و جۆرێكی تر وەكو شوێن یان فاكتەری بواری تاك كە بریتییە لە (توانا و بڕوانامەی زانستی و پیشەیی و پێوەندییە گشتییەكان و چالاكیی جۆراوجۆر).زۆر جار دەبینین، مرۆڤ لەنێوان بواری پۆزەتیڤ و بواری نەگەتیڤ بۆ گەیشتن بە ئامانج سەری لێ دەشێوێ، چونكە مەیلەكان زۆرن و ئاراستەكان فرەوانن،واتە زیاتر لە ئەگەرێك شی دەكاتەوە بۆ گەیشتن بە ئامانج. لێرەدا تاك ئەو هێڵە هەڵدەبژێرێت كە تاوگیریی ڕەوشتیی بەسەردا زاڵ دەبێت و تاك بەو ئاراستەیە دەجووڵێنێ و بۆ دەستە بەركردنی ئامانج یان گۆڕینی و جێگرەوەی ڕەوشت. مەبەستی سایكۆلۆژیی فیزیای دەروونی، ئەوەیە هەر كەسەو بۆشاییەكی ژیانی هەیە (Life Space) بەو پێودانگەی كە هەر بوارە كە تاك تێیدا سەربەست دەبێت و لەوێوە بگاتە یەكێك لە حەزەكانی و تێركردنی ئەویش دوو ڕووی هەیە، بۆشایی ناوەوە،واتە خود كە مرۆڤ لە چەند كۆمەڵە غەریزە وحەز ومەیل پێكهاتووە و هەوڵی ئەوە دەدات لە سنووری بواری خۆی جێبەجێی بكات و ڕووی دووەم ژینگەی دەرەوەیە كە كۆمەڵێك دابونەریت و یاساو فاكتەرسالاری دەگرێتەوە، تاك لەوێ سەربەست نابێت، بەڵام هەوڵی ئەوە دەدات بۆشایی نێوان هەردوو دیو كە پێی دەوترێت فەزای ژیان، كۆنترۆڵ بكات و هاوسەنگی و هاو گونجان پەیدا بكات،ئەویش لە ڕێگای شارەزایی و زیرەكی و تواناو هێزی كەسایەتی دەبێت،ڕەنگە ئەم هاوسەنگییە ببێتە هۆی بەیەكەوە گرێ دانی دوو بواری كۆنتراست لە تاكدا كە لە پەنای ئەم بۆشاییەوە كۆمەڵێك نهێنی و ڕازی خۆی حەشارداوە،وەكو وزەیەك بەكاری دەهێنێ لەكاتی هێرش بردنە سەری، بەهۆی فشاری كۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونی وزەحمەتی ژیان..

**سەرچاوەکان**

جیلفورد، میادین علم النفس النظریة و التطبیقیة، ترجمة: أحمد زكي و آخرون، ط٢، دار المعارف بمصر، القاهرة، (١٩٦٢).

دمام الكيالي، دراسات في علم النفس، مكتبة الشرق الجديد، بغداد، (١٩٧٧).

كالظن، مبادیء علم النفس الفرويدي، ترجمة: يوسف ميخائيل، مطبعة العاني، بغداد، (١٩٧٩ ).

## شیکردنەوەی (ئەو)ی کەسایەتی



دوای ئەوپێشکەوتنە سەرسامەی کە لە بوارەکانی زانستی تەکنەلۆژیاو هۆیەکانی گەیاندن و ڕاگەیاندن و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی دەماغی مرۆڤ و داگیرکردنی بۆشایی ئاسمان ڕووی دا،سایکۆلۆجستەکان ئەمڕۆ داماون و دەستەوەستانن بەرانبەر نهێنییەکانی ئەو (ID)ی کەسایەتی مرۆڤ کە چەندین کۆنگرە و دایەلۆگ و گفتوگۆ و توێژینەوەی چڕو زانستی کراوە،بەلام هیچ ئاکامێك بەدی نەهاتووە بەرانبەر نهێنییەکانی ئەو (ID) کە داینەمۆی کارکردنی وزە شاراوەکان و پاڵنەرە غەریزییەکانی مرۆڤە.هەموو سایکۆلۆجستەکان دوای بڕیاردانێکی بنەڕەتی کۆگای (ئەو)بە سندووقی ڕەشی مرۆڤ ناوەزدکراوە کە هەموو نهێنییەکان و حەز و ئارەزووەکان و چێژ و غەریزەکان و خاڵە لاوازەکانی مرۆڤ تۆمار دەکات. لە دابەشکردنی کەسایەتی تاك بە پێی هەرەمی زانستی دەروونی کراوە بە سێ بەشی سەرەکی (ئەو، من، منی بالا). هەموو ئەو توێژینەوانەی کە سەر بزوێنەری (ئەو) کراوە، دەرکەوتووە (٧٠٪)ی کەسایەتی مرۆڤ داگیر دەکات، ئاراستەی نێنەری تاکە بۆ هەموو کارەکانی نهێنی و ژیانی ڕۆژانە. ئەو بەشە بریتییە لە کۆگای غەریزەکانی بنەڕەتی و پێداویستەکانی ناوەوەی مرۆڤە بە کرداری نائاگا و عەقڵی باگن و خەون و خەیاڵ و کردارە خۆشەویستییەکان و چێژ و دواچێژ



ئێمە ناتوانین کۆنترۆڵیان بکەین و دەسەلاتمان بەسەریاندا ناشکێ لە ململانێی بەردەوام دان لەگەڵ واقیع و دەوروبەر، بۆیە (ئەو) هەموو کات پێمان دەڵێ ئەوەی خۆت حەزت لێیە بیکەو حەزە چڵێسییەکان تێر بکە بەبێ گوێ دانە یاساو دابونەریت و کۆمەڵ و ئایین و دەوروبەر هەر خۆت بژیت، واتە بەدوای تێربوونی حەزە خودییەکان دەگەڕێ،ئەگەر لەسەر ئەرکی بەشەکانی تری کەسایەتی بێت، واتە لەسەر حسابی واقیع و من و منی بالاو ویژدان و بەهای تاکەکەس و کۆمەڵ و باوەڕ و دوارۆژ بێت،خۆ خۆشەویستی و خۆپەرستی و تێرکردنی حەزە چڵێسییەکانی تاك دروشمی (ئەو)ە، هەموو سنوورەکان دەبەزێنێ، ئاکارەکان دەڕووشێنێ، بەشێوەیەکی مەنتیقی بیرناکاتەوە، ئامانجی تێربوونی حەزەکان هەموو شتێکە بەهەر هۆکارێك بێت و زانیانی بەپێی لێکدانەوەی یەکەم بیرکردنەوەی مرۆڤ (ئەو)پێویستی بە چ شتێك بێت یەکسەر بیری لێ دەکاتەوە و تاك پاڵ پێوە دەنێت بۆ جێبەجێ کردنی بەبێ بایەخ دان بە کۆمەڵ و دەوروبەرو شکاندنی سنووره سانسۆرەکانی مرۆڤ.هەروەها دەرکەوتووە هیچ پێوەندییەکی ڕێکخەر لە نێوان (ئەو) و دەوروبەردا نییە، بۆیە ئەوەی دەیەوێ دەیکات، غەریزە شەهوانییەکان تێر دەکات. (ئەو)ی کەسایەتی لە دوو بەشی سەرەکی پێك هاتووە، یەکەم: غەریزەی مەرگ (ساناتوس)واتە تێکدان و ڕووخێنەر و شەڕانی و دژایەتی ئەم بەشەی (ئەو)ی مەرگ بڕیاری تێکدان و ڕووخاندنی هەموو شتە جوانەکانی واقیع دەدات لە مەرگەساتی کەسانی تر چێژ وەردەگرێت، خووە شەڕانییەکان و ڕەوشتی شەڕانی و چەقۆ وەشێن شکاندنی شتەکانی دەوروبەر کاری سەرکی ئەم بەسەیە،کە لە منداڵی ڕق و تووڕەیی و عینادی و کەللەڕەق و لاساری و شەڕ و دەربەستی و لائوبالی دەگرێتەوە،ئەمەش بریتییە لە تێرکردنی ئاژەڵی و بەرەڵلاکردنی حەزە شەهوانییەکانی تاك کە دوو جۆر دەگرێتەوە، یەکەم: سادیزم واتە ئازاردانی خەڵکانی بەرامبەر بۆ چێژ وەرگرتن و دامرکاندنەوەی حەزەکان ئەمەش دوو ئاستی هەیە، یەکەم: ئاستی بەهێز ئەم جۆرە کەسانە ڕادەی

شەڕانگێزییان زۆر بەهێزە،هەمیشە دکتاتۆر و جەلاد و پیاوکوژ و باندی مافیا و تیرۆریست و قاچاغچی و سەرکردە سەربازییەکان و چەتە کە کاری سووتاندن و لەناوبردنی کۆمەڵ و ڕەوشتی جینۆسایدو کۆمەڵ کوژی..تاد کە بە بینینی خوێنی کەسانی تر هەست بە ئارامگیری دەکەن، بەلاّم ئاستی دووەم، بریتییە لە سادیزمی لاواز،واتە ئازاردانی خەڵکانی تر بۆ گەیشتن بە چێژ لە ڕێگای دەستوەشاندن و قسەکردن و تفکردن و جنێو و بوختان و چاڵ هەڵکەندن بۆ کەسانی ترو درۆی شاخدار و زەرەر لە خەڵك دان و گەزەگرتن...تاد، ئەمانە دەچنە خانەی مەرگ ئاستی سادیزم.زۆر جار لە ڕێگای خۆشەویستی و سێکس ئاستی دووەمی سادیزم پێڕەو دەکرێت، بەلاّم جۆری دووەمی غەریزەی مەرگ ماسۆشیزمە، واتە گەیشتن بە چێژ لە ڕێگای ئازاردانی خودی خۆت، ئەمەش لە مندالّ وەکو لەخۆدان و سەر لەدیواردان و خۆپیسکردن و زمان گەستن و لێوکرۆشتن...تاد، بەلاّم لە گەورە محاسەبە کردنی خودی خۆی و ویژدان ئازاردان و خەفەت خواردن و مانگرتن لە خواردن و بێ هوودەیی و لۆمەکردنی خودی خۆی و ڕەنگ زەردی و کزی و لاوازی دەبێتە نیشانەکانی ماسۆشیزم. لەوانەیە ببێتە پاڵنەرێك، تاك زیاتر توندڕەوی بکات،لە گۆشەگیری تووشی بەدمەستی و بێ هۆشی و مادده سڕکردنەکان بێت.

زۆر جار ئەگەر پلەی ماسۆشیزملە مرۆڤ بەرزبووو ئەوا پلەی بێ هوودەیی و ئازاردانی خودی زۆر زیاد دەکات، ئەنجامەکەی بە خۆکوشتن کۆتایی دێت کە بەرزترین پلەی ئازاردانی خودە. (ئەو) پالّی پێوە دەنێت ئەم کارە بکات بۆ گەیشتن بە چێژ و ئەم جۆرە خۆکوشتنە بریتییە لە (خێرا و هێمن) و لە پیاو ئافرەت بەپێی دەسەلاّتی، جۆری خۆکوشتنەکە دەگۆڕێت، پیاوئەو ئامێرانە بەکار دەهێنێت کە گوزارشت لە بەهێزی خۆی دەکات وەکو (گوللە، خۆهەڵواسین، خۆفڕێدان لە شوێنی بەرز)، بەلاّم ئافرەت (خۆسووتاندن، دەرمان خواردن...) ئەمەش هەردوو ئاستی چێژ وەرگرتن و ئازاردان بەرامبەر یەکتر دەبن وزۆربەی کەسانی ماسۆشیزم شەرمن و ترسنۆك و چاولەدەر دەبن وەکو دووپشك لەژێرەوە پێوە دەدات، نامەرد و



چاوپان دەبن. زرۆ جار ئەم حالّەتەی ماسۆشیزم زۆر بێ ئافات دەبێت و عەشقی خودی دەبێت، وەکو نەرگزی کە بە دوو قۆناغ دەڕوات، قۆناغی مندالّی واتە لە خۆڕازی بوون، بەلاّم لەتەمەنی هەرزەکاری و گەورەییدا، واتە لە خۆبایی و خۆپەرستی و وەهم کردن لە جوانی و زێدەڕۆیی لە بیروبۆچوون و خۆ چەسپاندن و بەکەم زانینی دەوروبەر و سەیرکردنی بە چاوی سووك بۆ بەرامبەر وبەرزکردنەوەی دروشمی (من گەورەمو چونکە دەوروبەرەکەم بچووکە) و غەریزەی مەرگ واتە تێکشکاندن و لەناوبردن. کاتێ دوو ئاژەڵ لە یەك جۆر بەشەڕ دێن ئەگەر دڕەندەترین ئاژەڵیش بن ئەوا تەنیا یەکتر بریندار دەکەن، واز لە یەکتر دەهێنن،بەلاّم کاتێ مرۆڤەکان بەشەڕدێن ئەوا یەکتر دەکوژن و دەبڕن و دەسووتێنن دەست و قاچ دەقرتێنن، یەکتر لەناو دەبەن. جاری واش هەیە غەریزەی لەناوبردن بەهێز دەبێ، کاتێ دوو تاك بەشەڕ دێن، یەکێکیان دەمرێ دوای مردن دەی سوتێنێ و لەقەبر دەری دەهێنێ، لە ناو ئاژەلاّندا ئەم کارە ناکرێتو بەلاّم جۆری دووەم، بریتییە لە غەریزەی زیندووبوونەوە و ژیان و بەردەوامی و سەرهەڵدان. لەم غەریزەیەدا فرۆید ناوی ناوە غەریزەی سێکسی کە بە دوو شێوە دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت و لە (ئەو) بگاتە حالّەتی تێربوون، شێوەی یەکەم، هەڕەمەکییە واتە جێبەجێ کردنی کاری سێکسی بە شێوەیەکی بلاّوو بەبێ گوێدانە دابونەریت ویاسا وکۆمەڵ، بێ ئەوەی هیچ سنوورێك بۆ ئەو کارە دابنرێت، چونکە تاك لە بۆشایی تێربووندا دەژیت بە هۆی زۆر حەرامکراوەکان و سنوورە بچووککراوەکان، ئەوا ناتوانێت وەکو غەریزەکانی تر بە سەربەستی بە دوای تێربووندا بگەڕێت، ناچار پەنا بۆ بەرلادان دەبات، ئەویش بەهۆی فشاری ئابووری و کۆمەلاّیەتی و ئایینی و دابونەریت ڕێگرەکان زۆر دەبن ناتوانرێت لە حالّەتی (من)دا ئەم کارە بکرێت، بۆیە بەشێوەیەکی (ممنوع المرغوب) بەدوای تێربوون دەگەڕێت و بەرەڵلاّیی سێکسی لەناو کۆمەڵ دروست دەبێت، شوێنی قاچاغ زۆر دەبێت، بەلاّم جۆری دووەم بریتییە لە چۆنایەتی ئەم کردارە بۆ پارێزگاری کردنی جۆری تاك لە ڕێگای کردارە سێکسییەکانەوە بۆ پێکهاتنی خێزان، ئەمەش حالّەتێکی پۆزەتیڤانە بۆ بەردەوام

بوونـی حاڵەتە نائاگاییەکانی (ئەو) لەگەڵ کردارە سێکسییەکان کە بە ڕێگایەکی ڕەوا جێبەجێ دەکرێ و باجی لەسەر نییە لە نێو کۆمەڵدا قبووڵ دەکرێت. لەکۆتاییدا (ئـەو)لـە ململانـێی بـەردەوام دایـە لـە بەرامـبەر خـۆ چەسپاندن بەسەر بەشەکانی تـری کەسـایەتی، ئـەو ململانـێی (ئـەو) لەگـەڵ ٠مـن و مـنی بـالاّ)دا زۆر جار بـاری ئـابووری و زەحمـەتی ژیـان و ململانـێی تاکـەکان و گـەیشتن بـە پلەی کۆمەلاّیـەتی و دەسـەلاّت...تـاد ئـەوا هـەموو ئـەو فاکـتەرە حەزانییـە دەبنە پاڵپشت بۆ سەرکەوتنی (ئـەو) لـە شـەڕی بەشـەکانی کەسـایەتیدا، ئەمـەش (ئـەو) بـە تـاك دەڵێـت هـەموو ڕێگایـەکان ڕەوان بـۆ گەیشتن بـە ئامـانج بـا ناشـیرینترین ڕێگـاو نابەجـێترین هۆکـار بێت، با لەسەر حسابی کەسانی تر بێت. گرینگ ئامانج بەدەستهێنان و گەیشتنە دوا پلـەی چـێژە. لـەم شـەڕەدا ئاکار و قیـەم و بەها و هزر و ویژدان و وتە بریقەدارەکان دەخرێـنە ژێـر پـێ، بـۆ سـەرکەوتنی (ئـەو) لـە بەرامـبەر (مـنی واقیعی و منی بالاّی میـپالی)،بۆیـە تـاك پـێکهاتەیەکی ئـاڵۆزە لـە کۆمـەڵێکی کۆنتراستی میزاج و بۆچوون پـێك هاتووە کە دوو دیوی مرۆڤ لێك دەترازێنێت، دیوی دەرەوەی شتێکە ڕووکەش و ماسـکێکی داڕێـژراوە،بەرنامەکـراوە بە پێی بەرژەوەندی پاراستنی خودی تاك، بەلاّم دیـوی نـاوەوە زۆر جـیاوازە لـە دیـوی دەرەوەی لـە جیهانـێکی تر دەژیت و جیهانێکی داپۆشـراو لـە کۆمـەڵێك نهێـنی شـاراوە و کـردەوەی لـە پەنا پەردە، لەوانەیە بە هیچ شـێوەیەك ئاشـکرای ناکـات لەگـەڵ خـۆی دەیخاتـە گـۆڕەوە، بۆیـە زۆر جـار گوفـتار و کـردەوە زۆر لـێك دوورن،تەنانـەت پێچەوانەی یەکترن لە تاکدا بە پێی بەرژەوەندی کـاتی،واتـە ئەو بەشە زۆرەی کەسایەتی کۆمەڵێك دەزگای هەواڵگری و سیخوڕی تێدا کۆبۆتەوە،بۆتە نهێنی تاك  هەموو ڕێگای ناڕەوایی پێ ڕەوا و لەبارە، هەموو کردەوە نابـەجێ و نایاسـایی، پـێ بـەجێ و ڕەواو یاسـایە تەنـیا بـۆ گەیشـتن بـە چـێژە غەریزیـیەکان و چڵێسـیوونی تـاك ئـەو چـێژەی کـەوا گوفـتار و کـردەوە پێچـەوانە دەکاتـەوە بـە بـێ سانسـۆر و بەرپرسـیارییەتی لـە جیهانـێکی فـراوان کـار دەکـات. دەتوانـین لـەم توێژیـنەوەدا بڵـێین ئـێمە چـۆن دوای شـەیتان کـەوتووین، پێناسـەی شەیتان چۆن بکەین، لەمرۆڤدا جێگای لە کوێیە....



<u>سەرچاوەکان</u>


٭فروید، سیجموند، ما فوق مبدا اللذة، ترجمة اسحق رمزي، دار المعارف مصر، ١٩٦٩.

٭فروید، سیجموند، الجنس واثره في السلوك الانساني، ترجمة فؤاد نصار، بیروت، ١٩٧٠.

٭غنیم، سید محمد،سیكولوجیة الشخصیةو محدداتها- قیاسها- نظریاتها، دار نهضة القاهرة، ١٩٧٥.

٭ آنا، فروید، الأنا و میكانزمات الدفاع، ترجمة صلاح مخیمر، القاهرة، مكتبة الانجلو، ١٩٧٧.


## لێکدانەوەی سایکۆلۆژی  بۆ دەستەڵاتی کاریزمی

ئەدلـەری سایکۆلۆژیسـت،ئـەوەمان بیرەخاتـەوە کـە تـەواوی ئـازادی ڕەهـا ترسـناکە لەسـەر ئاسایشـی تـاك و کۆئـەندامی دەروونـی و سیسـتەمی کەسـایەتی مـرۆڤ تـێك دەدات. ئـەو کاتـەی ئـەم پەیڤانـە بـەبێ سانسـۆری سـایکۆلۆژی بلاّوکـرانەوە، بوونـە نۆبــەرەی ململانــێی دەروونــزانی تــاك و دەروونــزانی کۆمەلاّیــەتی و هەریەکــەو نمایـندەی خۆیـان لـە ئەزموونگـەری سـایکۆلۆژی کێشایەوە. بلاّوکـردنەوەی کتێـبی (ترسـان لـە ئازادی)زەنگی هێمایەك بوو بۆ دروست کردن و سەرهەڵدانی سەرکردەو ڕابـەری نـاو کۆمـەڵ،تـەواوی سایکۆلۆژیستەکانی تاك دروست بوونی سەرکردە، لەناو خـودی کۆمـەڵ، دەیگێرنەوە بۆ ئامادەیی دەروونی و کەسایەتی تاك، واتە ئامادەکاری پێشـینەی خـودی تـاك و کەسـێتی سـەرکەوتوو چـەکەرەی دروسـتبوونی سـەرکردەو پێشـەوایە، لەگـەڵ ئەمەشـدا هـەندێ فاکـتەری نـاوەندی دەوروبـەر، دەخەنـە پـاڵ سـەرکردە بـۆ بەهـێزبوونی بیردۆزەکـەیان، ئەگەرچـی میکاڤیـلی خـودی کاریـزما بـۆ ڕەهـەندەکانی مـێژوو دەگەڕێنێـتەوە،بـەلاّم زۆر لـە کرداری و پەرچـەکرداری تاك و کۆمەڵ بە پێداویستی دەستەلاّتی کاریزمی دادەنێت.

ئەگـەر دەستەلاّت لای سایکۆپۆلۆتیك لووتکەی سەرکەوتنی ڕێگایەکی دووربێت، ئەوا لای میکاڤیـلی لووتکـەی هـێزو دکـتاتۆریەتە، بـەلاّم لای سایکۆلۆژیسـتەکان دەسـتەلاّت

هێمای کاریزمی تاکە لەناو کۆمەڵ،واتە دەرچوون و سەرهەڵدانە لەناو کۆمەڵ. ڕەوا پێدەرانی دەستەڵاتی تاك دەڵێن:کاریزما هێمای تاکی کۆمەڵە لەنێوان وەهمی مێژوو و وەهمی کەسایەتی تەواو،دەبێتە پێداویستی مێژوویی و دروست کردنی سفری دەست پێ کردنی مێژووی ئەو کۆمەڵە.. دەروونزانی تاك دروست بوونی کاریزما بە هێمای سایکۆ-سیسولۆژی ئەو گروپ و نەتەوەو گەلە دادەنێت و چەند بیردۆزێکی جووڵێنەر ئەم ڕەهەندانە دیار دەکەن. بۆ نموونە، ئەگەر لەسەر پێکهاتەی خێزان قسە بکەین (ئەکولی) دەڵێ، خێزان پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی سەرەتاییە، پێوەندی و کارلێکی نێوان ئەندامەکانی ڕاستەوخۆیە.

لە خێزاندا باوك پایەیەکی تایبەتی و ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە، هەروەك چۆن دایك و کوڕو کچ پلەو ڕۆڵی تایبەتیان هەیە. بەم شێوەیە تا پێکهاتەکان گەورەبن، هەر توێژەو ڕۆڵی تایبەت و هەڵسوکەوتی تایبەتی هەیە، تا دەبێتە دیاردەیەکی سەرتاپاگیرو ڕێکخراو و حزب و هەموو توێژو چینەکانی کۆمەڵ بە گشتی دەگرێتەوە.ڕابەر ئەو کەسەیە کە پایەیەکی تایبەتی هەیەو تێدەکۆشێ بۆ وەدەست هێنانی ئامانجەکانی کۆمەڵ و پاراستنیان، هەروەها هەوڵ دەدا چالاکی و هەڵسوکەوتی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ ڕێك بخات لە پێناو دەستەبەرکردنی ئامانجە ستراتیژییەکان.بۆ ئەم مەبەستەو بۆ پێناسەکردنی چەمکی کاریزما دوو قوتابخانە هەیە:

قوتابخانەی یەکەم:کاریزما بە کەسە دەبینێ کە هەندێ سیفەتی تایبەتی تێدایەو لە ڕێگای ئەو سیفەتانەوە تواناو بوونی لەناو کۆمەڵدا دەچەسپێنێ.

قوتابخانەی دووەم: ئەو سیفەتانە دەخاتە پاڵ کۆمەڵ، نەك کەسی کاریزما. براون، یەکێکە لەو زانایانەی کە پشتگیری لە قوتابخانەی یەکەم دەکاو دەڵێ: کاریزما بەهرەیەکی دەروونییە لە هەموو کەسێکدا نییە. براون بەهرەی زیرەکی بە نموونە هێناوەتەوە کە لە هەموو کەسێکدا نییە. بەهەمان شێوە زانایان بیکی و ترگولد، پشتگیری لەم بۆچوونە دەکەن، بەلام بە بۆچوونی قوتابخانەی دووەم کاریزما





تایبەتمەندیی تاکە کەس نییە، بەڵکو کردەیەکە کە کۆمەڵ بەگشتی بەشداری تێدا دەکەن، چونکە تەنیا کۆمەڵەکە کەسی کاریزما (ڕابەرو سەرکردە) هەڵدەبژێرێ یا دیاری دەکا....کاتل،یەکێکە لە دەروونزانانە کە پشتیوانی لەم بۆچوونە دەکاو لەو بڕوایەدایە کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵ بە گشتی بەشداری لە پرۆسەی کاریزما دەکەن و هەموو پێکەوە لە پێناو وەدی هێنانی ئامانجەکان هەوڵ دەدەن، بەلام گرینگترین تیۆرەکانی کاریزما لە هاوچەرخی ئێستای سایکۆ- پۆلۆتیك بریتییە لە:

١-تیۆری تایبەتمەندییەکان:پەیڕەوانی ئەم تیۆرە لەو بڕوایەدان کە ڕابەرایەتی سیفەت و تایبەتمەندی خۆی هەیەولەهەموو کەسێکدا نییەو پێوەندیشی بە فاکتەرە کولتوورییەکانەوە نییە،واتە ئەگەر کۆمەڵ و فاکتەرە کولتوورییەکان لەیەکتر جیا بکەینەوە،دەردەکەوێ سیفەتی هەندێ کاریزی تەنیا لەناو هەندێ ئەندامی کۆمەڵدا هەیە جگە لەوانی تر لە زانایان ئەو سیفەتانە لە ڕوانگەی (بۆماوە)وە سەیر دەکەن.هەندێکی تر لەمیدانەدا توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زۆریان پێشکەش کردووە، لەئەنجامدا گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە سیفەت و تایبەتمەندییەکانی ڕابەر لە زۆر کەسدا هەیەو فاکتەرە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکانیش کاریگەریی خۆیان لەو بوارەدا هەیە. جۆری ڕابەریش بەپێی جیاوازی کۆمەڵ و گرووپ و کولتوورە کۆمەڵایەتییەکانیش دەگۆڕێ.زۆر لە زانا دەروونناسەکان هەوڵیان داوە سیفەت و تایبەتمەندییەکانی کاریزمی بە پێوەرێکی بابەتی دیاری بکەن. لە کاریزمێکەوە بۆ کاریزمێکی تر دەگۆڕێ.لێرەوە کاریزما ئەو کەسە نییە کە سیفەتی دیاریکراو و تایبەتمەندی نەگۆڕی خۆی هەبێ،بەڵکو ئەو کەسەیە کە کاریگەریی لەسەر کۆمەڵ هەبێ و کۆمەڵیش بەهەمان شێوە کاریگەریی لەسەر ئەو هەبێ.

٢-تیۆری ئەرکەکان: پەیڕەوانی ئەم تیۆرە،کاریزما بەو کەسە دەبینن کە لەیەك کاتدا چەندین ئەرکی جۆراوجۆر دەگرێتە ئەستۆ. ئەو کەسەیە کە هەوڵ دەدا پێوەندی نێوان ئەندامان و توێژەکانی کۆمەڵ بە پتەوی بهێڵێتەوەو ئامانجەکانیان دەستەبەر بکات. بە مانایەکی تر (ڕابەر) کاریزما ئەو کەسەیە کە ئەرکە

جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ لەیەك ئەرکی سەرەکیدا یەك دەخاو، ڕەوتی ئیش کردنی به ئاقارێکی ڕێکخراودا دەبا.

٣-تیۆری هەڵوێست وەرکرتن: ئەم تیۆرە لە ڕوانگەی هەڵوێست وەرگرتنەوە دەڕوانێتە کەسی کاریزما...کاریزما ئەو کەسەیە کە بەرامبەر دیاردەکانی هەڵوێست وەردەگرێ،لەو ڕێگەیەوە کاریگەریی لەسەر کۆمەڵ بەجێ دێڵێ کە خۆی تیایدا ئەندامێکە.

کاریزما ناتوانێ ئەرکی ڕابەرایەتی (سەرکردایەتی) جێبەجێ بکات تا زەمینە بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان خۆش نەکا، چونکە هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکان هەمیشە لەبەرژەوەندی ئەندامانی کۆمەڵدا نین و هەندێ کات کاریگەریی سلبیش بەجێ دێڵن.

٤-تیۆری کارلێك کردن:ئەم تیۆرە لەسەر پێوەندی و کارلێککردنی بەردەوامی نێوان کۆمەڵ و لایەنە سەرکییەکانی کاریزمایەتی دامەزراوە کە بریتین لە خودی کاریزما...پەیڕەوانی کاریزما... هەڵوێست. سروشتی کارلێکی کۆمەڵایەتی تەوەرەی سەرەکی ئەم تیۆرەیە بە گوێرەی ئەم تیۆرە کاریزما چۆن خودی خۆی دەناسێ، پێویستە بەهەمان شێوە ئەندامان و پەیڕەوانی خۆی بناسێ و ئاشنابوونی هاوبەش لەنێوان کاریزما و پەیڕەوانی کاریزمادا هەبێت.

لێرەوە کاریزما ئەو کەسەیە کە بە پێی پێوەر و بەها کۆمەڵایەتییەکان و ئامانجەکانی کۆمەڵ، هەنگاو دەنێ. کاریزما ئەو کەسەیە کە لەکاتی هەڵوێست وەرگرتن و کارلێکی نێوان چین و توێژەکاندا بوون و تواناکانی خۆی دەسەلمێنێ.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە شۆڕش و گۆڕان، دوو دیاردەی کۆمەڵایەتین کە پابەند دەبن بە کۆمەڵگا داخراوەکان، لەم کاتانەدا ڕاڤەکردنی بارە کۆمەڵایەتییەکان و دەروونییەکان فاکتەرێکی کاریگەرە بۆ سەرکەوتنی ئەم شۆڕشە و بەردەوام بوونی پرۆسەی گۆڕان. ڕاڤەکردنی سایکۆلۆژیەتی تاك و کۆمەڵ، زیاتر ئامادەیی بوونی تاك ڕادەگەیەنێت بۆ بەردەوام بوونی پرۆسەی جیهانگیری و هەزم کردنی فاکتەرە





گۆڕاوەکان.زانا دەروونییەکانی کۆمەڵ، ئەوەیان دەرخستووە، تاك بەهۆی کاریگەریی ناوەوەی،زیاتر دەبێتە پاڵنەر بۆ گۆڕان و کودەتا لەسەر خود!!. جا دۆزینەوەی ئەو فاکتەرە دەروونییە شاراوانەی مرۆڤ کۆنترۆڵی خاڵە لاوازو سەلبییەکانی کۆمەڵ دەکات، دەتوانرێت بە پێی ئەوە بونیادی دهاتووی پێوەندی کاریزماو کۆمەڵ دابڕێژرێت.

لە کۆمەڵانی ڕۆژهەڵاتدا زیاتر هەستە دەروونییەکان و هەستە مرۆییەکان بە شێوەیەکی ئاڵۆزگیر تێکەڵ بە سیستەمی گشتی ئابووری و سیاسەتی هەنووکەیی کراون و نەتوانراوە شارەزاییەکی ئەوتۆ لە سروشتی تاك و کەسایەتی ئەو کۆمەڵە وەربگیرێت و پێوەرێك بۆ سیفات و کەسایەتی تاکی هەڵکەوتوو دابڕێژرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتەرێکی سەرەکی، وەکو پەرتەوازەیی توێژەکانی کۆمەڵ و پێناسەنەکردنی عەقڵیەتی مەعریفی ئەو کۆمەڵە. لەگەڵ نائارامی باری سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەرهەڵدانی خودی کاریزمای تایبەت بە توێژێك یان قۆناغێکی ناپراکتیکی مێژوویی.

لە سیستەمی نوێی جیهاندا شۆڕش و گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێوەندییەکی دیالیکتیکانەی بەژیانی کۆمەڵەوە هەیە کە خودی مرۆڤ چەند پرۆسەیەکی زانستی دەروونی دەیگرێتەوە. گۆڕانی ئەم پرۆسەیە لە دیدگا دەروونییەکانی کۆمەڵدا وادەخوازێ فاکتەری داڕووخان و کپ کردن و هەڵگەڕانەوە ڕووەو زیادی بڕوات لە ململانێی دەروونیدا.

دەروونزانی بوونیادگەری دەڵێت: پێکهاتن و دروست بوونی کیانی کاریزماو وەستانی جەدەلی و گۆڕانە میکانیزمییەکانی دەروون، دەبێتە هۆی لێکترازانی تاك لەگەڵ کۆمەڵ، هەرچەندە ئەم دابڕانە زیاد بکات، مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا تووشی نامۆیی دەبێت. بۆ دەرباز بوون لەم پەژارە دەروونییە، پێویستییەکانی مرۆڤ بە پێی بیردۆزی (ماسلۆ) سەرهەڵدەدەنەوە بۆ تێربوونی پێویستییەکانی تاك، ئەمەش هۆیەکی گرنگە بۆ بەرزکردنەوەی دروشمی (بەتاك بوونی ئازادییەکان) لەلایەن

کۆمەڵێ خەڵکەوە،چونکە هەموو گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵ لە بێزاری و کپ کردنی ئارەزووەکانی خودی تاك دەست پێ دەکات، هەرچەندە تاك ئۆقرە نەگرتووبێ، دەیەوێت بەرەو باری ئۆقرەگرتنی دەروونی و ئارامی هزری بڕوات.
لەم حاڵەتەشدا سەرهەڵدانی کاریزما (ڕابەرو سەرکردە) بە شێوەیەکی بەرچاو و خێرا لە کۆمەڵگا داخراوەکان دەبێت، چونکە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوین، بە کۆمەڵگایەکی دەروونی سارد ناودەبراو پێداویستییەکانی تاك زیاتر لە پەراوێزدا بوون و بایەخیان پێ نەدەدرا. چەمکی ئایدیۆلۆژییەکانی سەرووتر کە بە زۆر دەسەپێنران بەسەر تاکدا،تاك تووشی کوژانەوەی دەروونی دەبوو. واتە بە پێی تیۆرەکانی پاڤلۆڤ و واگسون،هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و گۆڕانکارییەکان پێویستیان بە پاڵەپەستۆیەکی دەروونی هەیە، بەپێی تاقیکردنەوەی پاڤلۆڤ: بۆ هەموو ورووژاندنێك و جووڵانەوەیەك پێویستی بە ئامادە بوون هەیە، بۆ سازکردنی زەمینەی وەڵام دانەوەی پێویست بەرەو گۆڕان، کەواتە بۆ ورووژانی کۆمەڵایەتی،دەبێ وەڵام دانەوەی دەروونی هەبێت بۆ ئامادەکردنی خودی ئەو کەسەو بە کۆمەڵ بوونی تاك بۆ پێك هێنانی وەڵام دانەوەیەکی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکان.هەر وەك قوتابخانەی دەروونناسی لە ئەوروپا ئەوەیان سەلماندووە کە هەموو پە شۆکاوییەکی دەروونی دەگەڕێننەوە بۆ هۆکاری جەنگەکان.
واتە لە جەنگی جیهانی یەکەم لایان وابوو کۆمەڵگای ئەوروپا زیاتر وابەستەیی و ئارامی دەروونی و ئاکاری باشی هەبووە،بەڵام کارەساتی شەڕ دیاردەیەکی نەگەتیڤی کردە سەر خودی تاك لەناو کۆمەڵدا،لە ئاکامی تێکچوونی شیرازەی پێوەندییەکانی خێزان و ئەم کارەساتەش کارتێکردنێکی درێژخایەنی لەسەر قووڵ بوونەوەی ململانێ لەنێوان من و منی باڵا و هەست و ناهەست کرد کە خەڵك لەسەر هێڵی وابەستەیی دەروونی لادەدات و بەرەو بەرەڵڵایی هزری دەڕوات، چونکە هەر دەست پێشخەرییەکی چاك لە (منی باڵا)وە ڕوودات (من) ڕەتی دەکاتەوە، ئاکارە ڕاستەکان لەنێوانی ململانێی هەست و ناهەست دەفەوتێن.





وەکو ئەوەی دیاردەی بێ هوودەیی بە تەواوەتی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا لە ئەوروپاو ئەمەریکا سەری هەڵدا. ئەم دیاردەیەش لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و هونەرییەکان و کاری ڕۆژانەی خەڵك ڕەنگی دابووەوەو بووە هۆی نەمانی سەرهەڵدانی کاریزمای تاکی کۆمەڵ.
هەموو دیاردەی ململانێی دەروونی مرۆڤ لەژێر کاریگەریی گۆڕانکارییەکان و سیستەمی کۆمەڵایەتی دێتەکایەوە، چونکە هەر گۆڕانێکی نوێ، بارێکی دەروونی نوێ بە خۆوە دەبینێ، بەڵام فرۆید، ئەم دیاردە دەروونییە دەباتەوەلایەکی تر، وەکو ئەوەی دەڵێت،تێرنەکردن و خەفەکردنی ڕەمەکی سێکسی دەبێتە هۆی توندوتیژی تاك لەناو کۆمەڵداو شەڕی دوو کەس و دوو خێزان و دوو شاریش دەگەڕێنێتەوە بۆ سەری ململانێی سێکسی لە تاکدا کە جاك لاکان بە شێوەیەکی تر باس لەبارە تێرنەکراوەکان دەکات کە ئەلتەرناتیڤی ئەمە، کارە هەڕەمەکییەکانی خودە.
لەبەر ئەمە تاك بەرەو نامۆیی هەنگاوی دەناو دەبووە کەرەستەیەکی بەرهەم هێنانی و بەرگری کردن لە سیستەمێك کە خۆی تێدا بەشدارییەکی هەستپێکراوی ون بوونی کەسایەتی و خودی تاك لەنێو پێوەندییەکانی بەرهەم هێنان و هێزی بەرهەم هێنان بە زەقی دیارو بەرچاو بوو، تا ئاستی ئەوەی خودی ململانێ لەنێوان من و منی باڵا زۆر سڕوکزبوو، نەبووە هۆی جووڵاندنەوەی تاك، تاك لەم کۆمەڵگایەدا لەسەر کەتەلۆك بونیادی کەسایەتی دەنراو لەهەموو هەستە کەسایەتییەکان ڕووت دەکرایەوە، سەرکوت کردنی سەلماندن و پێگەیاندنی خود لەتاکدا دەبێتە هۆی لاوازی و کزی هەموو چەکەرەیەکی داهێنان و بونیادکردن لە سەرهەڵدانی ڕابەرو سەرکردە. تاك بەهۆی ململانێی و پێشبڕکێی بەرامبەرەکەی، خاڵە لاوازو کەموکورییەکانی خۆی دەدۆزێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەم ململانێیە نەبوو، ئەوا کەسایەتی داهێنانی تاك بەیەك هێڵی کێرڤی ڕاست دەڕوات. ئەمەش داهێنان لای تاك کەم دەکاتەوە، تووشی سڕبوون و سستی دەکات. بە پێچەوانەوە پێوەندییە دەروونییەکانی ڕۆژئاوا لەسایەی سیستمی ئابووری و بۆرۆرێنی بازاڕی ئازاد، تاك لە

توێکی ململانێی توندوتیژیدا دەژیت بۆ دروست کردن و داهێنانی شتی نوێ کە جێ پەنجەی تاك زۆر بە زەقی پێوەی دیار دەبێت، خۆی خاوەنی ئەو کارە دەبێت و دەبێتە هۆی هاندان و پاداشت بۆ تاك لە مەیدانی پێشبڕکێی بەردەوام بۆ ئەنجام دانی کاری نایابتر، ئەگەرنا وەك ئاو ماڵکە بەرکەنار دەکەوێت، بە پێی بیردۆزی (پورندایك) واتە پاداش و سزا. لە ئەنجامی ململانێی باری ژیان و یاسای بێ کەتەلۆك، ململانێی (من و منی باڵا) توندتر دەبێت و دەبێتە هۆی دژایەتی جەمسەری دژ بەیەك و گۆڕانێکی نەپساوە دروست دەکات لە کەسایەتی تاك، لەئاکامدا کەسایەتییەکی سەرکەوتوو دەبێت. ئەمەش یەکێکیان ئەوەی تر ڕەت دەکاتەوە،ئەلتەرناتیفێکی دەروونی بۆ دروست دەبێت کە منی کۆمەڵایەتی منی خود ڕەت دەکاتەوە،هەوڵی خۆ گونجاندن لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی و گۆڕانی دیالێکتیکی تاك و سروشت دروست دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی هۆیەکانی ئۆقرەگرتنی خودو پێ بەپێ ئارامبوونی سیستەمی کۆمەڵایەتی و هێنانەکایەی دادوەری کۆمەڵایەتی دێتەدی یان هۆیەکانی تەکنەلۆژیا بۆ بەختیاریی خەڵك دەبێتە ئۆقرەگرتن و ئاسوودەیی تاك، چونکە هەر کاتێ تاك هەستی کرد کە کیانی پارێزراوەو مەترسی لە ناوچوونی نییە، بە ئازادی بیردەکاتەوەو لە سایەی ئاسوودەیی خود و کۆمەڵدا، بەدوای یاساو شێوازەکانی پێشکەوتن دەگەڕێ کە مسۆگەری داهاتووتەکی پرشنگدار بێت، خۆی سازو تەیار دەکات بۆ گۆڕان و بەرەوپێشچوون، ئەو دەمە کەسایەتی سەرکەوتوو دەبێت و تاك دەگاتە لووتکەی هەرەمی تێربوونی پێویستییەکانی کە ئۆقرەگرتن و ئارامییە، ئەو کاتە خودی تاك دەبێتە کاریزمای کۆمەڵ نەك چاوەڕێی کاریزما بکات و ببێتە دوا ئامانجی سەروەری و پیرۆزی تاك و کۆمەڵ، چونکە پیرۆزترین کاریزما لە ناخی تاك خۆی دروست دەبێتو دەبێتە بەشێك لە یاساو پارێزەری یاسای کۆمەڵ و بەدیموکراسی بوونی ژیانی ڕۆژانەی. لە چاوەڕێی گۆدۆ ناژیت، هاوتا لەگەڵ پێشکەوتن دەبێت، ئەوکاتە





هێزی تەکنەلۆژیا بەهۆی هێزی ئابووری و بەکارهێنان، سەنتەری دەستەڵات و کاریزما دروست دەکات.

بێگومان جەنگ‌هەموو کاتێ بارێکی سایکۆلۆژی گۆڕاو بەرەو داڕمانی چوارچێوەی ئاکاری دەروونی دروست دەکات و هۆکارێکە بۆ دۆزینەوەی ئایدۆلۆژییەتێکی لەبارو گونجاو پێ بەپێی گۆڕانکارییەکانی سەردەم بگۆڕدرێت، زانا سایکۆلۆژییەکان زیاتر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، بەتایبەتی لە ڕۆژئاوادا کەوا بەر لەوەی سیاسەت و بەرنامەی دەوڵەت دابڕێژن،دیراسەی قووڵی سایکۆلۆژییەتی کۆمەڵ دەکرێت، واتە ئایدیۆلۆژییەتی فەرمانڕەوا هەوڵدەدات هاوشان لەگەڵ بارە دەروونییەکانی تاك و کۆمەڵ هەنگاو بنێت، بۆیە بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیای دەوڵەت هەموو کات لە گۆڕان و خۆگونجاندندا دەبێت. بۆ ئەو مەبەستەش توێژینەوەکانی دەروونی لەم دەوڵەتانە زۆرن و بایەخی تایبەتیان پێ دەدرێت، چونکە ئەوان لەسەر سێ کوچکەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پێوەندییەکانی بەرهەم هێنان و شیکردنەوەی دەروونییەوە، توێژینەوەی هەمەلایەنی کۆمەڵ دەکەن، بەڵام کەسایەتی تاك لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بەپێی بیردۆزی پاڤلۆڤ ملکەچی تیۆری ورووژاندن و وەڵام دانەوە دەبن،ئەگەر ورووژاندن نەبێ ئەوا وەڵام دانەوەی دەروونی لای تاك بەرەو سستی و کزی دەڕوات و چالاکی دەروونی نامێنێت، چونکە هەرچەندە تاك بەرەو گۆڕانی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان بچێت و لە فەلسەفەی دەروونزانی دابڕێت، ئەوا تاك تووشی کپ بوونی دەروونی دەبێت، دوای ئەو هەموو فشارە کە لە دەوروبەر دەکرێتە سەر خودی تاك،ئەوا لەهەموو بوارەکانی ژیان تووشی نشوستی دەبێت. دەبێتە هۆی ئەوەی کە ململانێ لە نێوان هەست و ناهەستدا دروست بێت و ببێتە هۆی ڕەت کردنەوەی خودی واقیعی و گەڕان بە دوای هێمنی و ئۆقرەگرتنی خود، ئا لەو کاتە ئاواتە دوا خراوەکانی و ئارەزووە کپ کراوەکان وەکو بورکان لە خودی تاك دەتەقێتەوە و تاك لە یاسا کۆمەڵایەتییە باوەکان هەڵدەگەڕێتەوە، دەچێتە سەنگەری دژایەتی کردنی دەسەڵاتی تاکڕەوی یان فەرمانڕەواوە ئاستی سایکۆلۆژییەتی

درندایەتی لە خودی تاك هەڵدەشاخێت و ڕووبەڕوویان دەوەستێت. تینوێتی و تاسەیی خود بۆ باری ئۆقرەگرتن و هێمنی بەدوای ئەلتەرناتیڤی دەسەڵاتی كاریزمی دەگەڕێت و تێدەكۆشێت،ڕەوتی چەقبەستوویی فەرمانڕەوایەتی بگۆڕێت، هەر ئەم بارودۆخەیە كە تاك هان دەدات نائۆقرە بوونی خودی خۆی لە بۆتەی نائۆقرەی تێكڕای كۆمەڵ ئاوێتە بكات و شۆڕشێك بەرپابكەن دژی دەستەڵاتە توندڕەوەكان. ئەمەش لە تاكەوە بۆ كۆمەڵ و لە كۆمەڵیشەوە بۆ تاك دەبێت. هەر لەم ساتەشدا فۆرمە دەروونییەكان بە جۆشتر دەبن،بۆ زیاتر وروژاندنی ئارەزوو و ئاواتە كپ كراوەكانی تاك و زیادكردنی ململانێ لەنێوان خودی واقیعی و خودی خەیاڵاوی كە لەم بوارانەدا خۆی دەنوێنێ، وەكو ((پروپاگەندە هاتە هات(أشاعه) وفێڵی بەرگری، ڕاگەیاندن و تابووری پێنجەم...))

ئەمەش هۆیەكی سەرەكی گەورەیە بۆ وروژاندنی هەستی سەرانی كۆمەڵگا، كەوا كاری پێداچوونەوەی سیستەمی كۆمەڵایەتی خۆیان ئەنجام بدەن ، لەم ماوە دوورو درێژەدا و هەوڵی ئەوە بدەن گۆڕانكاری بەسەر بهێنن، چونكە خودی داهێنان لای تاك دەبێ بەپێی كات و سەردەم گۆڕانكاری بەسەر بهێنرێت، چونكە دووبارە بوونەوەی شتەكان، چەقبەستوویی و نەگۆڕانیان لای تاك، وردە وردە لەگەڵ ڕۆژگاردا تووشی بێزاری و نارەزایی دەكات و هەوڵی گۆڕانیان دەدات، چونكە بارە دەروونییەكانی مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە نوێ بوونەوە هەیە بەپێی كات و شوێن و ڕەوتی بەرەو پێشچوون بۆ زیاتر چەسپاندن و بەرجەستەبوونی كەسایەتی مرۆڤ و دەنگدان بە كەسێتی سەركەوتوو و كاریزمی كە مێژووی كۆمەڵ دروستی دەكات، نەك مێژووی خودی خۆی. ڕۆژهەڵات هەر لە كۆنەوە كۆمەڵگایەكی دامركێنەری خواست و ویست و ئیرادەی كۆمەڵ بووە، بۆیە ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆتە بازنەیەكی بۆشایی و تێرنەكردنی پێداویستییەكانی مرۆڤ، سیاسەتی باڵادەست و كۆسمۆپۆلیتی و هەست بەكەم كردنی دەروونی و كاوێژكردنی قارەمانیەتی و سەروەرییەكانی ڕابردوو كە هەمووكات حاڵەتی هەڵگەڕانەوە بۆ خودو ڕۆشنبیری كۆت و سڕكردنی



ڕەوتی جووڵانەوەی بەرەو پێشچوون و كۆسپ خستنە بەر ڕێڕەوی گەشەكردنی داب و نەریت و نەگونجان لەگەڵ ڕەوتی تەكنەلۆژیاو خۆبەستنەوە بە سەروەری كۆن و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و هەڵدانەوەو پیادەكردنی ئەو ئاكارە سەلبیانەی بە درێژایی مێژووی حوكمڕانیان سەپاندوویانە بەسەر گەلانی ناوچەكە، وەك ئەوان نەژادی پاك و باڵادەست و خاوەن شارستانییەت بن، بەڵام گەلانی تر كەمتربن، بێ بایەخ تەماشا بكرێن و دروست كردنی باری دەروونی سەلبی و كەسایەتی خۆ بەكەمزان و هەست كردن بە تاوان،سەپێندراوە بەسەر ئەو گەلانەی كە دەستەڵاتی فەرمانڕەواییان نەبووە،هەر لە سەردەمی كۆنەوە باری دەروونی توندوتیژی و سادی پێوە دیاربووە كە بە ڕەوشتی سادیزمی بە دەركەوتوون، ئەوەی شایانی باسە هەتا سەردەمانی هەنووكەیی لە دۆخی شێتگیرانەی سادیەت دەژین كە جیاوازی زۆریان لە نێوان كەسایەتی خۆیان دروست كردووە بەهۆی شارستانییەتی ڕشیالیزم و ئاینزاو شەڕخوازی خۆیان بەرامبەر كەسایەتی نەرم و هێمنی گەلانی دەوروبەر، ئەو گەلانەی كە بەكەسایەتی ئارەزوومەندی بە كۆمەڵ بوون و هاریكاری و ئیش كردن دەژمێردرێن و پێوانە دەكرێن،بەڵام بەهۆی عەقڵییەتی سادییەتەوە كە ڕێچكەی گرتبوو بە درێژایی شارستانییەتی كۆندا، بۆتە هۆی دروست بوونی نێوان خووڕەوشتی و كەسایەتی و تێكدانی پێوەندییە ڕوحییەكان و كەرامەتی خودی مرۆڤ،ئەوەش بۆتە هۆی دروست بوونی كولتوورێكی ناهاوسەنگ كە بووە هۆی دروست كردنی دوودڵی و گومان لە ڕابردوو و داهاتووی خۆیان كە بەر لە هەست (ماقبل الشعور) بەسەر هزری تاكدا زاڵ بوو، زیاتریش بەرەو هەڵگەڕانەوەی نەگەتیڤ گەڕایەوە لە بیركردنەوەداو ببێتە هۆی كوژانەوەی وەڵام دانەوەی هەموو وروژانێكی نەتەوایەتی بە هۆی ئەهنتی پڕوپاگەندەو كە چەندین ساڵە ئەم گەلانە لەژێر كاریگەریی كولتوورێكی نامۆ بە ویست و خواستەكانیان ژیاون كە بۆ نامۆبوونی سیاسەت و دوور لە واقیعی كۆمەڵایەتی و تەكنەلۆژیایەكی سەپێندراو دەگەڕێتەوە. ئەم كارەش ڕاستەوخۆ كاری كردۆتە سەر كارلێك كردنی سەلبی لەگەڵ

گۆڕان و هێنانە ناوەوەی تەکنەلۆژیا و ڕۆشنبیری سەردەم کە بەپێی پێداویستی تاك و کۆمەڵ نەبووە کە بتوانێت کەلێنی پێداویستییەکانی پڕبکاتەوە، بۆیە کۆمەڵی ڕۆژهەلاَت سەلبیانە مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکان و سیستەمی نوێی جیهان کردووە، بە شێوەیەکی تەئویلێکی تەمومژاوی لە هزری تاك لێك دراوەتەوەو گۆڕانکارییەکی هەڵەبوون و تاوان ئامێزی لە ناخی خود دروست کرد، بۆیە خەڵکان تووشی بێ ورەیی و داتەپینی کەسایەتی هاتوون. ئەم دەڤەرە هەر لە سەرەتاوە کەسایەتی ڕەش کراوەتەوە بەهۆی جۆری ئاینزاکانی نامۆ بە واقیعی ژیانیان و دژایەتی کردنی ویست و ڕووکاری بیری کورد بوون و بەنزم سەیرکردنی گەلانی ئەم دەڤەرە و دانانی لە خانەی پلەدوو،تا کارگەیشتە ئەوەی ئەنفالی هەستی نەتەوایەتی بکەن و شوونبزری بکەن لە ناو کولتووری دەوروبەرو سەروەردا، تا گەیشتۆتە ڕادەی هەڵگەڕانەوەو هێستریای ڕۆشنبیری.

بە درێژایی مێژوو دوژمن هەوڵی ئەوەی داوە کەسایەتی نەتەوایەتی لە ئۆقرەگرتن و هێمنی دووربخاتەوەو ویستەکانی بە تێرنەکراوەیی بەجێ بهێڵێت و پەژارەیەکی بەردەوام و سەرلێشێوانی درێژخایەنی بۆ دروست بکات تا پلەی گومان و دوودڵی لە بوونی خودی خۆی. تێرنەکردنی پێویستە سەرەکییەکانی نەتەوایەتی و شوشتنەوەی بەردەوامی مێشك و دروست کردنی ئەنتی ئاراستە و میولی کپ کراو لە هزری سیاسی و نەتەوایەتی کەوای کردووە لە هەندێ حاڵەتدا باوەڕ بە سەروەری و کولتووری دەستەلاتی دەوروبەر بکرێت و وا لە گەلانی ژێر دەستە بگەیەندرێت کە هەمووکات بڕا بچووك بووەو نەیتوانیوە بەرژەوەندی و سیاسەت و کولتووری خۆی بەڕێوەبەرێت کە ڕووکاری سلبی لە عەقڵی مەعریفی نەتەوایەتی دروست کردووە، ئەمەش بە بەکارهێنانی فاکتەری فێربوون و پەروەردەکردنێکی ڕشیالیزما نەبووە، بۆ گۆڕینی ڕووکاری دەروونی، ئەمەش چەواشەکردنی مێژوو و دیموگرافی و کەسایەتی کورد بووە، تەنانەت لە کولتووری ئەواندا زۆر بەزەقی لە هۆنراوەو چیرۆك و شانۆکانیان دەمارگیری ئەوان بە ئاشکرا دیار بوو کە ویستوویانە لە





کەسایەتی کورد کەم بکەنەوە، تەنانەت لە ئەدەبی منداڵانیش ئەمە زۆر بە زەقی ڕەنگی داوەتەوە، بۆ نموونە: منداڵی کوردیان کزو لاواز و ناڕێك بەرامبەر بە وێنەی خۆیان دروست دەکرد،لە هەموو بابەتەکانیاندا وایان نیشان دەدا کە منداڵی کورد بەسەزمانە و توانای نییە کارێك ئەنجام بدات یان شتێك جێبەجێ بکات، ناچار دەبێ پەنا بەرێتەبەر منداڵەکەی تر بۆ یارمەتی دانی و هاوکاری کردنی.

دروست کردنی ڕووکاری نادروست لە مێشکی منداڵان و زاڵ بوونی سیاسەتی ڕشیالیزم و درندایەتی لە نێوانیانداو دروست بوونی دژایەتی بە کەم سەیر کردنی هێمای (کاریزمای) نەتەوایەتی. چەندین بەرنامەیتر کە لەم سەیرکردنە دەبووە هۆی دروست بوونی ڕقوکینە و ئاراستەی سەلبی بەرامبەر نەژادی جیاواز لە ڕەنگ و نەتەوەدا و سەرهەڵدانی سایکۆلۆژییەتی دژایەتی بەرامبەر کە حەز نەکات ئەمیان بێت و حەز بکات ئەوەی تریان بێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دوو خودی دژیەك لە دەروونی مرۆڤ دروست دەکات و هەموو کات هەوڵی ئەوە دەدات کە گێژوێك دروست بکات و ئەوە بخاتە هزری کۆمەڵ کە دووشتی دژ بەیەك دروست بوون و دوو مرۆڤی جیا لەیەك هەن لەسەر زەوی،ئەمەش دەمارگیری کاریزما دەگەیەنێ کە هەموو هێما نەتەوایەتییەکان بە دزەکوژی (أرهاب) نابات ئەم هەموو فشارە ناڕەوایە لەسەر دەروونی کەسایەتی کوردو سڕینەوەی خودی نەتەوایەتی، وای کردووە کە هەمووکات بە دوای ئەلتەرناتیڤێك بگەڕێت بۆ بەتاڵ کردنەوەی هەڵچوونی دەروونی. ئەوکاتە شاخ بەدیلی منی واقیعی بووە بۆ کورد کە ئارامگیری بۆ گیان و دەروونی دەستەبەر بکات و بیکاتە مۆڵگەی ڕاست کردنەوەی خودی شێوێنراوی خۆی.شۆڕشی و قڕکردن، دوو دیاردەی ململانێی خودن لە نێوان سەلماندن و سڕینەوەدا، کەوای کرد خودی ئەم ململانێیە لەبێ دەنگییەوە بەرەو خودی ڕقوکینە بگۆڕدرێت بەرامبەر سیاسەتی دەمارگیری گەلان ئەمەش وەرچەرخانێك بوو بەرامبەر سایکۆلۆژییەتی سیاسی کە لە حاڵەتی هەڵگەڕانەوە بۆ پێداچوونەوە، چونکە هەر کاتێ هەڕەشە کرایە سەر ئاسایشی تاك، دەبێتەهۆی شلەژان و

پەشۆکاوی دەروونی لە حاڵەتی گرژی بەردەوام دەمێنێتەوە، لەبەر هۆی ئەم پەشۆکاوییە دەروونییە و پەنابردن بۆ هەموو تیۆرەکانی سیاسەت و ئایدیاو نەدۆزینەوەی ڕێگە چارەی ئۆقرەگرتن و سەلماندنی خود، وای کردووە کە سایەتی هەڵگەڕانەوە لە دامو دەزگای سەپێنراو بەکاربهێنن.

واتە ڕاڤەکردنی باری سایکۆلۆژی و سشیۆلۆژی کۆمەڵ و سەرکەوتنی دایەلۆگ بۆ وەرچەرخان لە بیروباوەڕی هەڵگەڕانەوە بۆ مەعریفیەتی سەردەم و گۆڕانکاریەکانی، چونکە هەموو خووڕەوشت و ململانێیەکی دەروونی و بەربەرەکانی کردنی نەخۆشییەکانی دەروونی ڕەنگدانەوەی ململانێی زۆرانبازی شەڕو سیاسەت بووە، کە ڕاستەوخۆ وابەستەی کێشە دەروونییەکانی مرۆڤە. لە کۆتایی سایکۆ-پۆلۆتیك-دا دەڵێین: سایکۆلۆژییەتی دەستەلآتی وەهەم، زیاتر دوورکەوتنەوەیە لە ئازادی ڕاستەقینە و ڕێچکەی یاساکانی بەشەریەت، بە ڕێژەی ئەوەی چەند لە دەسەلآتی وەهەم و غەریب بوون دوورکەوینەوە، دەبینە مرۆڤی خاوەن خودی ڕاستەقینەی خۆمان و خاوەنی دوو فاکتەری سەرکی بەرهەم و سروشت، چونکە سەرەتایەکانی ئایدیۆلۆژییەتی ئەم سەدەیە زیاتر شمولیەت و نەفی پۆلێن کردنی بیرورا بووە، بەلآم دەستەلآتی سروشت و کۆمەلآیەتی وەکو بازنەی حەلەزۆنی دووبارە ئەوەی هێنایەکایەوە کە دەستەلآتەکان دابەش دەکرێن و دەبێتە پۆلێن کردنی بیرورا و شارستانییەت بەپێی جیاوازی خودی کاریزمی. گینزبرگ درێژە بە خودی عەقڵی مەعریفی دەدات و دەڵێت، گۆڕان لە جیهاندا لە ئاستێکی باڵادا ڕوودەدا و شان بەشانی ئەو گۆڕانێکی ئاراستە کراویشە، چونکە بەرژەوەندی ئادەمیزاد و شتە ژیواریە بایەخ پێدراوەکانی پاڵی پێوە دەنێت لە ئاستی سیستەمە کۆمەلآیەتییە کۆنەکان لابدا، ئەمەش غەیب بوونی دەستەلآتی ڕاستەقینەی مرۆڤە....



## پەراوێز



سایکۆ- پۆلۆتیك: ئەم توێژینەوەیە بەشێکە لە (سایکۆ- پۆلۆتیك) دەروونزانی ڕامیاری (علم النفس السیاسی) کە بە ڕەواجترین و گرینگترین بواری دەروونزانی دادەنرێت لە سەردەمی شۆڕشی تەکنەلۆژیا و ڕاگەیاندن و جیهانگیری، سەرەتای ڕوشنایی ئەم دەروونزانییە لە گەرمەی شەڕی سارد دەستی پێکرد و لەلایەن سۆڤیەتییەکان و ئەمریکییەکان گەشەی کرد.

چەمکە کاریزما هێمایە بۆ کەسی هەڵکەوتوو لەناو کۆمەڵ کە هەموو توێژەکانی کۆمەڵ وەکو هێما سەیری دەکەن و جا هێمای سیاسی بێت یان ئاینی یان کۆمەلآیەتی.

کاریزما ئەو کەسەیە کە شۆڕشی کۆمەلآیەتی دەکات نەك کودەتا بەمان سەربازییەکەیەوە. بۆیە سایکۆلۆژی لەم ڕووەوە هەموو بوارەکانی بۆماوەیی و ژینگە و کۆمەڵ و کولتووری و کەسایەتی و زیرەکی و ڕەوشتە تایبەتییەکان بۆ سەرهەڵدانی کاریزما لێك دەداتەوە و گەڵێ جار خودی کاریزما بە سومبلی نەتەوە دێت.

*کپ کردنەوە : ڕووخان،گیرخواردنی تاك لە گەیشتن بە ئامانج و تێربوون یا داخستن و کۆسپ لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجی ئاگایی و نائاگایی حەزو ویستەکانی تاك.

*من (ego):لە شیکردنەوەی دەروونی بەشێکە لە کەسایەتی کە ئەو ڕادەگری و بەرامبەری دەوەستێ، ئەمەش لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی واقیعی ژیانی ڕۆژانە.

*منی باڵا (super ego):زاراوەیەکە زانایانی شیکردنەوەی دەروونی بۆ دابەش بوونی کەسایەتی بەکاری دەهێنن،بۆ بەڵگە لەسەربوونی شتێك یا پانتاییەك لە هۆشی ناوەوە کە بە ئەرکی ویژدان و (قیم) و ئاکار دەردەکەوێت. لە ململانێی بەردەوامی (ئەوId) کەسایەتی غەریزەکان و چێژدایە.

*هەڵگەڕانەوە (نکوص): وەکو ماکدۆناڵد لێکی داوەتەوە باوەڕی وایە ئامرازەکانی ڕەوشتی منداڵ بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، کاتێ سەرهەڵدەداتەوە، ئەگەر کارە وەزیفییەکانی بیری باڵا لە کار بکەون و جۆرێکە لە فێڵی بەرگری دەروونی بۆ قەرەبوونی کارە بێ بەشکراوەکان.

*ڕشیالیزم: زاراوەیەکی سیاسی دەروونی نییە، بەمانای دەمارگیری و تیرۆری دەروونی دێت.

*وەستان (کف): چەپاندن،وەستانی هەموو وەلآم دانەوەیەکی تاك لەگەڵ دەوروبەردا، بەهۆی نەمانی فاکتەری ورووژاندن (پاڤلۆڤ).

*ڕووکار (إتجاه): مەیل و هێڵی فیکری و سیاسی و ئایدیای تاك له واقیعدا.

جـاك لاكـان: دەروونــزانی بونــیادگەری فەرەنســی‌یــە کــە لەســەر تــیۆرەکانی فــرۆید *پێداچوونەوەیەکی زانستی کرد.

*پـاڤلۆڤ: زانایـەکی سروشـتی ڕووسـی‌یـە (١٨٤٩-١٩٣٦). دامەزرێـنەری تویژیـنەوەی چـالاکی مێشکە لای زیـندەوەرو مرۆڤ.گەورەترین زانای فەسلەجی پێوەندی کاری فەسلەجی لەگەڵ ڕەوشتی تاك بنچینەی بیردۆزەکەیەتی، واتە وروژاندن= وەڵام دانەوە.

*سورندایك:خـاوەنی هەرسـێ یاسـای شوێنەوارو بلاوبوونەوەو مەشق کردنە، کو پورندایك بـاوەڕی وابـوو ئـەم سـێ یاسـایە دەگەڕێـتەوە بـۆ کـردارێکی فسـیۆلۆژی شـاراوە، بـەلام سروشتییەکانی دیارنەکردووە.



## سەرچاوەکان


صلاح نصر، الحرب النفسية معركة الكلمة و المعتقد، القاهرة سنة ١٩٦٦، ج٢.

عبد المنعم المليجي: أختبار تداعي الافكار للتشخيص السيكولوجي، دار المعارف بمصر ١٩٦٦.

تايلور: صراع الطبيعة والعقل مع اللاهوت، ترجمة أحمد سباعي، القاهرة ١٩٦٨.

أحمد عكاشة: الطب النفسي المعاصر، مكتبة الانجلو المصرية ١٩٦٩.

سيجموند فـرويد: الموجـز في التحليل النفسـي، سـامي محمـود علـي و آخـرون، دار المعـارف، القاهرة ١٩٦٩.

سلوى سامي: الابداع و التوتر النفسي، دار تجريبية دار المعارف المصرية ١٩٧٢.

سيد محمد غنيم: سيكولوجية الشخصية، دار النهضة العربية ١٩٧٣.

طينزبرط: تقيم فكرة تقدم، اسماعيل خطاب، لندن ط١١، ١٩٧٤.





حـامد عبدالسلام زهـران: مفهـوم الـذات و السلوك الاجـتماعي، مجلة جامعة عبدالعزيز، ع٢، ١٩٧٦.

١٠- سعد جلال: سيكولوجية حرب الباردة، دار النهضة العربية ١٩٧٩.

١١- أدلرك الخوف من الحرية، دار الطليعة، بيروت ط٢. ١٩٨٦.

١٢- فرويد و آخرون: التخليل النفسي للقيادة، دار النهضة، بغداد ١٩٨٨.




## کتێبە بلاوکراوەکانی نووسەر:

## ١- سایکۆلۆژییەتی منداڵو خێزان

## چاپکراوەکانی سەنتەری نما ٢٠٠٤

١-راپسکانێ لە دنیای سیاسەت و گەڕانەوەیەك بۆ دنیای شیعر
لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.. ماجید نووری

٢-جەژنی مەرگ، شیعر ، کەژاڵ ئیبراهیم خدر

٣-گلگامێش: و: ئیدریس شێخ شەرەفی



٤- شوێنکاتی یەکەم، لەدووەم و ئێستای سەگوەڕ،
لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، عەبدولموتەڵیب عەبدوڵلا.

٥- دەرونزانی، وتار لێکۆڵینەوە ن شیکردنەوە
یوسف عوسمان حەمەد